# لەم نامیلکەیەدا

لە چەند خاڵێکی پوخت و گوشراودا پێناسەی ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کراوەو، هەوڵ دراوە ئیسلامێکی ڕاست و ساغ و بێ خلتە بخرێتە ڕوو، بۆئەوەی هەم ئەوانەی خۆیان بە (ئیسلامی) دەزانن و، هەم ئەوانەی (نائیسلامی) بن لە ناسینی بەرنامەی ئیسلام و ڕێبازی پێغەمبەردا بەهەڵەدا نەچن .







پێشکەشە بە ماموستاو ئەمیر مامۆستا علی باپیر کراوە
ئەحمەد کرکوکی
٤ صفر ١٤٤٠
١٣/١٠/٢٠١٨



## پێشکەش بێ

بەو مسوڵمانە بیرتیژو دڵــــــڕوون و سینگ فراوانانەی کە ئیسلامیان لەبـــەر تیشکی قورئانی بەڕێزو سوننەتی بەپێزو بەرەهەمو کەلەپووری ڕەسەنی زانـــاو پێشەوایانی خاوەن حورمەت و ڕێــــزدا وەرگرتووە، لە ئەنجامی ئەمــــەش دا

تێکڕای ئوممەتی موحەممەدیان لەباوەش گرتووە، لە پێناوی بەرزی و پاراستنی بەرنامەی خواو ڕێبازی پێغەمبــــەری پێشەوادا قۆڵیان هەڵماڵیوەو خۆیـــان فیداکردووەو چاکی جیهادو مەردایەتییان بەلادا کردووە .

## پێشەکی

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله وصحبه ومن والاه .

مسوڵمانی سەنگین و شیرین !

هەروەک چۆن باغو بێستانەکان بەهۆی ئاودران و خزمەتکرانەوە بە تەڕو تازەیی و گەشی دەمێننەوەو بەرو میوە دەردەکەن ، وە بە پێچەوانەوە لە سۆنگەی ئاونەدران و خزمەت نەکرانەوە سیس و پەژموردەو چرچو زەرد دەبن و دەست دەکەن بە گەڵاڕێزان ، بەرنامەو پەیڕەوەکانیش بەهەمان شێوە ، ئەگەر بێت و شوێن کەوتووانیان بە پیری تیژی عەقڵ و هەست و سۆزی دڵ و هێزو گوڕی بازوویان خزمەتیان بکەن و، بە خوێنی هەناوو ئارەقی نێوچاوان و پارەو سامانیان ئاویان بدەن ، ئەوە بێگومان بە ئەندازەی ئەو خزمەت کرانو

ئاودرانە گەش و پاراو دەبن و دێنەبەر، دەنا سیس و کەنەفت دەبن و زەرد هەڵدەگەرێن!

جا بێگومان (ئیسلام) یش لەو یاسایە ڕیزپەڕ نیەو گەشەکردن و مانەوی لەبرەوکەوتنیو نەمانی بەندە بە تێکۆشان و هەڵخزانی شوێن کەوتووانیەوە.

پێغەمبەری پێشەواشمان صلی الله علیه وسلم لە فەرموودەیەکی دا فەرموویەتی:

(فان الدین بدا غریبا وسیعود غریبا كما بدا فطوبى للغرباء، وهم الذين يصلحون ما افسد الناس من بعدي من سنتي) رواه الترمذي عن عمرو بن عوف.

واتە: بێگومان ئایین بە غەریبی سەری هەڵداوە، وە هەروەک چۆن بە غەریبی هاتوە هەر بە غەریبیش دەگەڕێتەوە – مەیدانی ژیان – جا بەختیاری بۆ غەریبان، ئەوانیش ئەوانەن کە ئەوەی خەڵک لەدوای من لە

ڕێبازی من تێکیان داوە چاکی دەکەنەوە .(١)

جا مسوڵمانی خۆشەویست و بەڕێز !

بەئومێدی ئەوەی کە ئێمەش خوای میهرەبان بە لوتفی خۆی لە ریزی ئەو غەریبانەمان بژمێرێ کە بووژاندنەوەی ئیسلام و ڕێبازی پێغەمبەریان بە نسیب دەبێ ، پاش ئیستیخارەو ڕاوێژکردن ( استشارە ) دەستم کرد بە نووسینی ئەم زنجیرەیە ، هیواشم وایە کە ئەم زنجیرەیە ناوو نێوەڕۆکی یەک بن و ، دەورێکی کاریگەری هەبێ لە بووژاندنەوەی درەختی ئیسلامی پەژموردەو ، چاککردنەوەی ڕێبازی تێکدراوی پێغەمبەردا صلی اللە علیە وسلم .

---

(١) لە بەندی (١٧) ی ئاڵقەی شەشەمی زنجیرەی ( با چاکتر ئیسلام بناسین ! ) دا کە ( ئایین ) ە ، ئەم فەرموودەیە توێژراوەتەوە .

هەڵبەتە من بەو نیازەی کە خستمەڕوو دەستم کرد بە نووسینی ئەم زنجیرەیە، جا نازانم تا چ ڕاددەیەک تێیدا سەرکەوتوو دەبم، ئەوەندە هەیە داوام لە تۆی شیرین و بەڕێز ئەوەیە کە هەرچی یەکت بەدڵ بوو و پێت وابوو لە مەحەکی قورئان و سوننەت دەردەچێ، سوپاسی خوای لەسەر بکەو هەوڵ بدە خۆتیشی پێ پێ بگەیەنیو لە خەڵکیشی بگەیەنی، وە هەر شتێکیشت بەدڵ نەبوو و پێت ڕاست نەبوو زۆرت مەمنوونم کە بە دیاری بۆم بنێریەوە .

" والذين جاهدوا فينا لنهدينهم سبلنا وان الله لمع المحسنين "

علی باپیر
١٧/ رمضان /١٤٠٩ کۆچی / سەردەشت

## تێبینی

١- ئەم زنجیرەیە لە چەند ئاڵقەیەک پێک دێ ، کە لە هەر کامێکیان دا بابەت ( موضوع ) ێکی گرنگی ئیسلامی دەتوێژینەوە ، جا هەرچەندە جارێ هەموو ئاڵقەکانی ئەم زنجیرەیە تەواو نەبوو ون بەڵام دەتوانین ناوی هەندێکیان بەرین :( ڕێبازی پێغەمبەر کامەیە ؟)و( چاکترین ڕێ ی بەرەوخوا چوون) و( برایەتی مسوڵمانان چۆنە ؟) و( پێشمەرگەی ئیسلامی دەبێ چۆن بێ ؟) ... هتد .

٢- ئەم بابەتانەی کە لەم زنجیرەیەدا دەیانخەینەڕوو لەبەر چەند هۆیەک هەوڵدراوە یەکجار کورت و گوشراوبن ، بەڵام هەرکەسێک ویستی زیاتر لە بابەتێک بکۆڵێتەوە دەتوانێ سەرنجی زنجیرەی دوازدە ئاڵقەیی ( با چاکتر ئیسلام بناسین ) بدات .

٣- لەکاتی خستنەڕووی ( ڕێبـــــازی پێغەمبەر ) دا صلی اللە علیە وسلم
تا چاردەبین جاروباز بەشێوەیەکــــی ناڕاستەوخۆ پەنجە بۆ هەندێک لــــەو جۆرە بیروبۆچوون و لێکدانەوە هەڵــەو ناتەواوانە درێژبکەین کە لــــــەم سەردەمەدا لەسەر ئیسلام حیساب دەکرێن ، جا پێشەکی تکاکارم کە هیچ کــــەس نەیتان خوتخوتەی نەدات و گومانــــی وانەڕوات کە ڕووی قسانم بەتایبەتی لەگەڵ ئەو جۆرە بیروبۆچوون و دەستەو کۆمەڵەیە کە ئەو خۆی بە شوێن کەوتووی دەزانێ ، چونکە خوا ئاگادارە جگە لــە ڕاگەیاندنی هەقێک کە تێیدا گەیشتوومە بەناعەتی تەواوو ، بێجگە لـــــــــە ڕوونکردنەوەی ( ڕێبازی پێغەمبــــەر ) هیچ مەبەست و ئامانجی دیکەم نین :

" واللە علی ما نقول وکیل " .

## ڕێ خۆشکردن

مسوڵمانی بەڕێز !

هەر لەپاش بەسەرچوونی چاخی زێڕینی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و چوار جێ نشینە ڕەسەنەکانی خوا لێیان ڕازی بێ و، نەمانی حوکم و دەستەڵاتێکی ڕاستەقینە و ڕێک وپێکی ئیسلامی لە جیهانی ئیسلامیدا، لەنێو ئۆممەتی پێغەمبەری بەڕێزمان دا علیه الصلاة والسلام جۆرەها تەفسیرو لێکدانەوەو بیرو بۆچوونی جوێ جوێ سەبارەت بە دەقەکانی قورئان و سوننەت پەیدابوون و، لە سۆنگەی ئەمەشەوە چەندان جۆرە پێڕو تاقم و دەستە سەریان هەڵدا بۆ نموونە: ( خەواریج ، موعتەزیلە، مورجیئە ، قەدەری یە، جەبری یە، ڕافیضە ، باطنی یە ...) هتد .

بەلاّم وێڕای سەرهەڵدانی ئەو کۆمەڵ و دەستە جۆراوجۆرانە لەهەر

قۆناغێکی مێژووی ئیسلامدا کەسانێکی زاناو چاوساغو سەر ڕاستی واش هەبوو ون ، کە بتوانن وەک پێویست لەبەر تیشکی قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم لە بەرنامەی خوا حاڵی بن و ، ئیسلامێکی ڕاست و ساغو بێ خلتە بۆ خەڵکی بخەنەروو و ، بە پشتەری عەقڵ و نەقڵیش پۆرگی هەڵدمساوو بە بەز حسێب کراوی ئەو بیرو بۆچوون و لێکدانەوە هەڵەو ناتەواوانە بدڕێنن ، کە خەڵکێکی سادەو عەوام فریودەدەن و سەریان لێ دەشێوێنن و ، لە ڕاستە شەقامی پێغەمبەریان لادەدەن ، کە دەتوانین لەنێو ئەو زاناو پێشەوا ڕاست و ساغانەدا کە یەکجار زۆرن بە نموونە ناوی ئەمانە بێنین :

( حەسەنی بەصری ، سوفیانی ثەوری ، سەعیدی کوڕی مەسەییب ، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ، مالیکی کوڕی ئەنەس ،

موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعـــــی ، ئەبو حەنیفە ، ئەبولحەسەنی ئەشعەری ، جەعفەری صادیق ، شێخ جونەیدی بەغدادی موحەممەدی غەززالی، ئەلعیززکـــــوڕی عەبدوسسەلام ، شێخ عەبدولقادری گەیلانی، ئیبن و تەیمییە ، شەوکانی، حەســەنول بەننا ، ئەبولئەعلای مەودودی (..) خــوا لێیا ن خۆش بێ .

حا ئەمرۆش لەم ڕۆژگارەدا هەرکەسێک خوا لوتفی لەگەڵ نواندبێو لەبــــــەر تیشکی قورئان و سوننەت و کەلەپـــوورو بەرهەمی ڕەسەنی زانایانی ڕاستەقینەدا لە ئیسلام حاڵی بووبێ، بە ئاشکرا هەست پێدەکات کە لەنێوان ( ئیســــلام ) ی پێغەمبەرو چوار جێ نشینەکانیو، ئـــەو ئیسلامەدا کە ئەمرۆ زۆر جۆرە دەستـــەو کۆمەڵ لافی شوێن کەوتنی لـــێ دەدەن ، جیاوازی یەکی زۆر هەیە ، بەڵام بێگومان ئەندازەی کەمیو زۆری ئەو جیاوازی یــە لە دەستەیەکەوە بۆ یەکی دی فەرقـــی

هەیە، هەیانە زۆر دوورکەوتۆتەوەو لە چەندان لایەن دا بەهەڵەدا چووە، وە هەشیانە دووری یەکەی کەمترەو بەس لە لایەنێک و دووان دا بەهەڵەدا چووە.

بەهەر حاڵ منیش وەک قوتابی یەکی قورئان و سوننەت و فەقێیەکی زاناو چاوساغە ڕەسەنە پێشینەکانمان هەستم بە- بەرپرسیاری کردو بەپێویستم زانی منیش بە ئەندازەی خۆم پشکم ڕەگەل ئەو کاری بەرزو پیرۆزی چاککردن( اصلاح ) ە بخەمو، شوێن پێی ئەو ڕابەرو ماموستایانە هەڵبگرم، بەپێی توانا و بوولوان لەم نامیلکەیەدا لە چەند خاڵێکان دا ( ڕێبازی پێغەمبەر ) و ئیسلامی بێ خڵتەو ڕەسەن بخەمەڕوو و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش جاروبار پەنجە بۆ هەڵەو کەمو کووڕی ئەو جۆرە بیرو بۆچوونانە درێژ بکەم کە لەم ڕۆژگارەدا ڕەواجیان پەیداکردوەو، خەڵکی مسوڵمانیان دووچاری

دەستە دەستەیی‌و پەرتەوازەیی کـردوە ،
ئومێدیشم وایە هیچ مسوڵمانێک گومانـی
خراپ ( سوء الظن ) بەم کارەم نەبات‌و
لەهەر جێ یەکیش‌دا ڕەخنـــــــــــــەو
تێ بینی یەکی بەجێی هەبوو بۆم ببێتـە
ئاوێنەو، بە ڕاست‌کردنەوەم لە خۆیـــم
مەمنوون بکات .

" ان ارید الا الاصلاح ما استطعت ومـــا
توفیقی الا باللە ... "

## دوو مەسەلەی زۆر گرنگ

خوێنەری خۆشەویستم !

بە پێویستی دەزانم بەرلەوەی بچمە سەر ئەسڵی مەبەستکە ڕوونکردنەوەی ( ڕێبازی پێغەمبەر ) ە صلی الله علیه وسلم ، دوو مەسەلەی زۆر گرنگ بخەمەڕوو :

یەکەم : مەبەستمان لە ( ڕێبازی پێغەمبەر ) چی یە ؟!

لە وەڵامدا دەڵێین :

مەبەستمان لە ڕێباز ( طریقە ) ی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەو شێوەو چۆنیەتی‌یەیە کە ئەو زاتە - ڕووحم بەقوربانی بێ - بۆ بەڕێوەبردنی ئیسلام ڕەچاوی کردوە .

کەواتە مەبەستمان لە ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ( ئیسلام ) ە ، بەلام ( ئیسلام ) بەو

شێوەیەی کە پێغەمبەرو جێ نشینە ڕەسەنەکانی تێی گەیشتبوون و بەڕێوەیان دەبرد، نەک ئەوەی کە خەواریج و موعتەزیلەو ڕافیزەو ... هتدەکان بە هەڵە بە ئیسلامیان لەقەڵەم دابوو !!
وە نەک ئەوەی کە ئێستاش گەلێک جۆرە کۆڕو کۆمەڵ بە گومانی خۆیان بە ئیسلامی تێ گەیشتوون بەڵام لەڕاستیدا بەهەڵەدا چوو ون !
پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم لەبارەی ئەو خەت و ڕێبازەی خۆی و جێ نشینەکانی یەوە فەرموویەتی :
( فعلیکم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدین المهدیین عضوا علیها بالنواجذ ... )
رواه ابوداوود والترمذي وقال : حدیث حسن صحیح . ورواه احمد وابن ماجه والحاکم .
واتە : جا ڕێ و شوێنی من و ڕێبازی جێ نشینە سەر ڕاستە ڕێڕوونی کراوەکان بگرن ، ددانانی لەسەر ڕۆبگرن ... !

هەروەها فەرموویەتی :

( .. وتفترق امتي على ثلاث وسبعين ملة كلهم في النار الا ملة واحدة ، ما انا عليه واصحابي) رواه الترمذي عن ابن عمرو . واتە :

.. وە ئوممەتی منیش پەرتەوازە دەبێ و دەبێتە (٧٣) کۆمەڵ ، هەموویان لە ئاگری دان جگە لە یەک کۆمەڵیان – ئەوانیش ئەوانەن – کە لەسەر ئەو ڕێبازەن کە من و برادەرەکانمی لەسەرین .

کەواتە :

پوختەی قسان ئەوەیە کە مەبەستمان لە ( ڕێبازی پێغەمبەر ) صلى الله عليه وسلم ئیسلامە بەو شێوەیەی کە پێغەمبەرو برادەرە بەڕێزەکانیو جێگرە ڕەسەنەکانی بەڕێوەیان بردوە .

دووەم : گرنگی ناسینی ڕێبـــــازی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم :

پاش ئەوەی ڕوون بۆوە کە مەبەستلە (ڕێبازی پێغەمبەر) چییە ، زۆر بـــە ئاشکرا گرنگیو بایەخی ئەو خـــەتو ڕێبازو ڕێ و شوێنە بەرزو پیرۆزەمـــان بۆ دەرکەوت ،

چونکە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم لە فەرموودەیەکیدا کە (ترمذی) لـــە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصـــەوە گێڕاویەتەوە ڕای گەیاندوە کە لەپـــاش خۆی ئوممەتەکەی دووچاری بێ ســـەرەو بەرەییو پەرتەوازەیی دەبێ،وە ئاگاداری کردووینەوە کە تەنیا ئەو کۆمەڵـــە مسوڵمانە ڕزگارو سەرفرازی هـــەردووک جیهانن دەبن کە خەتو ڕێبازی خـۆی و هاوەڵە بەڕێزو وەفادارەکانی دەگرن .

ئێستاش با گرنگی ناسینی ( ڕێبـازی پێغەمبەر ) صلی اللە علیە وسلم لەچەند

خالێک دا بخەینەروو :

یەکەم : ناسینی ڕێبازی پێغەمبەر مەرجە بۆ تێگەیشتنی قورئان :

خوای کاربەجێ لەوبارەوە فەرموویەتی: ( .. وانزلنا الیک الذکر لتبین للناس ما نزل الیهم ) النحل / ٤٤ .

بەڵێ خدت و ڕێ و شوێنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم شەرح و لێکدانەوەی قورئانی بەپێزەو، بەبێ ناسین و گرتنی ئەو ڕێبازە بەرزو پیرۆزە ناتوانین لە قورئانێ حاڵی بین، چونکە قورئان زۆربەی مەبەستەکانی بەتایبەتی یاساکان ( الاحکام) بەکورتی ڕاگەیاندوون و قسەو کردەوەی بەڵوێستی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕوونیان کردوونەوە، بۆ وێنە: چۆنیەتی پێنج نەرزەکان و زەکات و حەج و ڕۆژوو و میرات و نیکاح و تەلاق و جیهاد ... هتد .

دووەم: بەبێ گرتنی ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ناتوانین بەرەو خوا بچین و لێی نیزیک بینەوەو، وا بکەین خۆشی بوێین، چونکە فەرموویەتی: ( قل ان کنتم تحبون الله فاتبعونی یحببکم الله..) آل عمران/٣١

سێیەم: بەهۆی ناسین و گرتنی ڕێبازی پێغەمبەرەوە لە ئاگری پەرتەوازەیی و دووبەرەکی دنیاو، ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ قوتار دەبین و، دەکەوینە سەر ڕاستە شەقامی ئیسلامەتی و سەرفرازی، وەک پێشتر باسمان کرد..

چوارەم: فەرمانبەری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانبەری خوایەو فەرمان شکاندنیشی بەهەمان شێوە، خوای زانا لەوبارەوە فەرموویەتی:
( ومن یطع الرسول فقد اطاع الله..) النساء/ ٨٠، واتە:

وه هەركەسێک فەرمانبەری پێغەمبـــەر بکات ئەوە فەرمانبەری خوای کردوە ..

دیسان فەرموویەتی: ( قل اطیعوا الله والرسول فان تولوا فان الله لا یحب الکافرین ) آل عمران / ٣٢ . واتە : بڵێ فەرمانبەری خواو پێغەمبەر بکەن ، جا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا ئەوە بێگومان خوا کافری خۆش ناوێن .

پێنجەم : وە لە کۆتاییدا :

خوای بەرزو مەزن زۆر بە تەئکیدەوە فەرمانی پێکردووین کە شوێن پـــێی پێغەمبەر هەڵگرین و بیکەینە سەرمەشقو پێشڕەومان : ( لقد کان لکم فی رســول الله اسوة حسنة لمن کان یرجو اللــه والیوم الاخر وذکر الله کثیـــرا ) الاحزاب / ٢١ .

وە فەرمانی پێکردووین کە هەرچـــی ئەو ڕابەرە ڕەندو ئاکار بەرزو پەسندە پێمان ڕادەگەیەنێ لێی وەربگریـــن و

هەرشتێک لێمان قەدەغە دەکات لێیی دووربکەوینەوە ، ئەگەرنا سزای توندی خوا چاوەڕێمانە :( ..وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا واتقوا الله ان الله شديد العقاب ) الحشر / ٧ .

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە کە بچینە سەر ئەسڵی مەبەست و لە دوو بەشی سەرەکیدا پێناسەی ( ڕێبازی پێغەمبەر ) صلى الله عليه وسلم بکەین ، لە بەشی یەکەمدا لە (٥) خاڵدا بنچینەو هێڵە گشتییەکان ( الاسس والخطوط العامة ) ی ئەو ڕێبازە بخەینەروو ، وە لە بەشی دووەمیشدا لە (٧) خاڵدا بۆچوون و هەڵوێستەکان ( الاراء والمواقف)ی ئەو ڕێبازە بتوێژینەوە .

ئیدی ئەتۆو بەشی یەکەمی ئەو نامیلکەیە .

بەشی یەکەم

# خەسڵەتە گشتی یەکانی ڕێبازی پێغەمبەر

صلی اللە علیە وسلم

## ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست !

بێگومان ( ڕێبازی پێغەمبەر ) صلی الله علیه وسلم بنچینەو بنەڕەتی گرنگ و لق وپۆپی وردی یەکجار زۆرن و خستنەڕووی ئەو هەموو بنچینەو بنەڕەتە گرنگ و لق وپۆپانە لە قەرەی نووسراوێکی کورتی ئاوادا نیە، بەڵام بۆ ئەوەی هەموو شوێن کەوتووێکی ڕێبازی ناوبراو سەرچاوەیەکی کورت و پوختی لەبەردەستدا هەبێ کە بتوانێ بە خێرایی سەروسیماو چۆنیەتی ئەو ڕێبازە بناسێ، ئێمە لە (٥) خاڵدا پێنج پایەو بنچینەی گرنگی ئەو ڕێبازە بەرزەمان خستوونەڕوو، کە دەتوانم بڵێم کۆکەرەوەی هەموو بنچینەو لقوپوپەکانی ڕێبازی ناوبراون .

حا ئێمە لە بەندی یەکەمدا لەژێر سەرباسی ( تێڕوانینێکی ژیرانە ) دا

چۆنیەتی بیروبۆچوون و هەڵوێستی شوێن کەوتووی ڕێبازی پێغەمبەران ڕوون کردۆتەوە، سەبارەت بە بوونەوەرو ژیان و ئینسان و ڕێگەو شێوازی ڕاستی وەدەست هێنانی ئەو تێڕوانینە ڕاست و ژیرانەیە.

ئنجا لە بەندی دووەمدا هاتووینە سەر خستنەڕووی مەسەلەی (بیروباوەڕێکی ئیسلامیانە) و لەچەند خاڵێکدا بیروباوەڕ (عقیدە) ی مرۆڤی مسوڵمانمان توێژیوەتەوە، ئەڵبەتە شایانی باسیشە کە پەیدابوونی بیروباوەڕێکی ئیسلامیانە ئەنجام و بەرهەمی سروشتی و چاوەڕوان کراوی (تێڕوانینێکی ژیرانە) ی بوونەوەرو دەوروبەرە، بۆیەش یەکسەر دوابەدوای تێڕوانین بیروباوەڕ هاتوە.

پاشان لە بەندی سێیەمدا مەسەلەی خواپەرستی (العبادە) مان توێژیوەتەوە چونکە خواپەرستی و بەندایەتی بۆ خوا

کردنیش ئەنجامو بەرهەمی بێ سێ و دووی بیروباوەڕێکی ئیسلامی یانەیە .

لە بەندی چوارەمیش دا چووینە سەر مەسەلەی خوو و ڕەوشت ( الاخلاق ) لەسۆنگەی ئەوەوە کە ڕەوشت و خووی بەرزو پەسند میوەو بەرهەمی ڕاستەوخۆی درەختی خواپەرستیو بەندایەتیی ( العبودیە ) یە .

لە کۆتاییش دا هاتووینەسەر مەسەلەی تێکۆشان ( الجهاد ) کە لووتکەی هەرەبەرزی ئیسلامەو ئەنجامو بەرهەمی هەموو ئەوانەی پێش خۆیەتی ، چونکە :

١- کەسێک خاوەنی تێڕوانینێکی ژیرانەبێت سەبارەت بە بوونەوەر چاوی بەربینایی نادات دوژمن و ناحەزانی خوا بە ڕەفتارو هەڵس و کەوتی ناقۆڵاو ناڕەوایان بوونەوەری ڕێک وپێک بشێوێنن و تێک بدەن ، بەڵکو توند دەستیان دەگرێ و لەگەڵیان بەشەڕدێ !!

٢- وە کەسێک بیروباوەڕێکی ئیسلامیانەی

هەبێ هەوڵ دەدات ناوی ئەو خـــواو پێغەمبەرەی کە لە خۆی و لە هەمـــوو شتێکی خۆشتر دەوێن لە هەموو ناوێک و بەرنامەکەیان لە هەموو بەرنامەیـــەک بەرزتر بن ، دیارە ئەمەش بەبێ تێکۆشان ناکرێ !

٣- وە هەرکەسێک خواپەرست ( عابد ) ێکی ڕاست و ڕەسەن بێ، هەوڵ دەدات غەیـــری خوا نەپەرستێ و غەیری بەرنامەو حوکمـــی وی هیچ پەیرەوێکی دیکە بەڕێوە نەبرێ، بەتایبەتی لەنێو کەسانێک دا کە خۆیان بە مسوڵمان دادەنێن !

٤- وە هەرکەسێک خاوەنی ڕەوشتێکـــــی بەرزو پەسند بێ، کە یەکەمین هەنگـــاوی ڕەوشتی بەرز لەگەڵ حەق دا بوون و دژی ناحەق بوونە ، دیارە تووشی جیهـــادو بەشەڕهاتن و خوێنک دادان دەبێ، چونکە ئەگەر ئەویش وانەکات ناحەق لەگەڵـــی بەشەڕدێ و یەخەی دەگرێ !

بەندی یەکەم

## تێڕوانینێکی ژیرانە

مسوڵمانی بەڕێزو حورمەت !

بەردی بناغەی ( ڕێبازی پێغەمبەر ) صلی الله علیه وسلم بریتیە لە وەدەست هێنانی تێڕوانین و بیرو بۆچوونێکی ژیرانەی ڕاست سەبارەت بەدو دەوروبەرەی کە تێیدا دەژین ، کە دەتوانین لە سێ شتان دا کورتی بکەینەوە :

١- بوونەوەر

٢- ژیان

٣- ئینسان

ئەو هۆیانەش کە شوێن کەوتووی ڕێبازی پێغەمبەر بەکاریان دێنێ بۆ هێنانەدی ئامانجی ناوبراو سێ شتن :

١- پێنج هەستەکان

٢- عەقڵ

٣- دڵ

لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە

دەتوانێ پەی بە ڕەنگ و دەنگ و تام و
بۆن و زبری و نەرمی و شلی و توندی و ..
هتدی دیاردە ماددی یەبەرهەستەکان
بەرێ و ، بەکورتی پێنج هەستەکان
وەک کۆمەڵە هەنگێک دەتوانن شیلەی
چەند مەعلووماتێکی سەرەتایی بۆ عەقڵ
کۆبکەنەوەو بیخەنە بەردەستی .
ئنجا ( عەقڵ ) یش بە یارمەتی پێنج
هەستەکان و بیرکردنەوەو وردبوونەوەو
ئەنجامگیری خۆی ، دەتوانێ پەی بە
چەندیەتی ( کمیە ) و چۆنیەتی ( کیفیە )
دیاردە سروشتیەکانی دەوروبەری بەرێ .
پاشان ( دڵ ) یش بە یارمەتی و
هاوکاری عەقڵ دەتوانێ تا ڕادەیەکی
زۆر ئینسان بە جیهانی مەعنەوی و ئەودیو
سروشت ( میتافیزیک ) ئاشنا بکات ، چ
لە جوغزی خودی ئینسان دا ، وە چ لە
دەرەوەی خۆی دا .
ئێستاش با چەند دەقێک لەوبارەوە
بهێنینەوە ، بۆ سەلماندنی ڕاستیی

ئەو قسەیەی کە؛ ڕێبازی پێغەمبەر
شوێن کەوتووانی وادار دەکات کە
لە ڕێی پێنج هەستەکان و عەقڵ و
دڵەوە هەوڵی ناسینی دەوروبەریان
بدەن و تێڕوانینێکی ڕاست و تەواو
دەربارەی بوونەوەر و ژیان و ئینسان
وەدەست بخەن:
١ـ خوای زانا و وردبین فەرموویەتی ؛
( ولاتقف ما ليس لك به علم ان السمع والبصر والفؤاد كل اولئك كان عنه مسئولا ) الاسراء / ٣٦ . واتە :
وە بەدوای شتێک مەکەوە کە زانیاریت
دەربارەی نیە، چونکە بێگومان بیستن و
دیتن و دڵ هەرکامێکیان بەرپرسیارە !
وەک دەبینین خوای زانا پێمان
ڕادەگەیەنێ کە بەبێ زانیاری و
شارەزایی بەرێیەدا تەڕۆین، کەواتە
لاساکردنەوەو شوێن کەوتنی کوێرانە
لە ڕێبازی پێغەمبەردا نیە، تنها لە
هەمان کاتیشدا تێمان دەگەیەنێ کە

هێزی بیستن و هێزی دیتن ودڵ هـــــۆی وەدەست هێنانی زانیارییین ، چونکـــــە دەفەرموێ هەرکەسێک هەوڵ نەدات بەهۆی وانەوە زانیاری پەیدا بکات ، ئـــــەوە یەک یەکی ئەو ئەندامانەی سەرکۆنـــــە دەکرێن و لێیان دەپرسرێتەوە .

لە جێیەکی دیکەدا بە راشکـــــاوی دەفەرموێ : هەموو ئەوانەی کە چاویـــان بەکار نایەنن بۆ دیتنی هەق و گوێ یان بەکار نایەنن بۆ بیستنیو دڵیان بەکار نایەنن بۆ تیگەیشتنی ئەوانە بـــــۆ دۆزەخ ئامادەکراون و ، وە حوکمـــــی ئاژەڵایەتیو خراپتریشیان بەســـــەردا دەدات و بە بێئاگایان لەقەڵەم دەدات .

٢- ( ولقد ذرانا لجهنم كثيراً من الجن والانس لهم قلوب لايفقهون بها ولهم اعين لايبصرون بها ولهم آذان لايسمعون بها اولئك كالانعام بل هم اضل اولئك هم الغافلون ) الاعراف / ١٧٩ .

دیسان پەروەردگاری بەرزو مـــــەزن

له چه‌ندان جێی قورئانیدا فه‌رمانمان پێ ده‌کات و تێمانه‌وه ڕاده‌خورێ که سه‌رنجی خۆمان و ژیان و ده‌وروبه‌رمان بده‌ین و ڕامێنین ، بۆ وێنه :

٣- ( قل انظروا ماذا فی السموات والارض ..) یونس/ ١٠١ . واته : بڵێ ته‌ماشاکه‌ن - و سه‌رنج بده‌ن - داخوا چ له ئاسمانه‌کان و زه‌وی دایه .

٤- ( قل سیروا فی الارض فانظروا کیف بدأ الخلق ..) العنکبوت/ ٢٠ .

واته : بڵێ به‌زه‌وی دا بگه‌ڕێن و سه‌رنج بده‌ن چۆن - خوا - دروستکراوه‌کانی هێناوه‌ته‌دی ..

٥- ( فلینظر الانسان مم خلق) الطارق/٥

٦- ( لقد خلقنا الانسان فی احسن تقویم ) التین / ٤ .

واته : بێگومان مرۆڤمان له چاکترین شێوه‌دا دروستکردووه .

٧- ( وفی انفسکم افلا تبصرون ) الذاریات / ٢١ . واته :

وه لە خۆتان دا ـ نیشانەی بوونی خودا ـ
هەن ، ئایا نابینن ؟!
٨ـ ( فلینظر الانسان الی طعامه )
عبس / ٢٤ . واتە :
با ئینسان سەرنج بداتە خواردنەکەی !
٩ـ ( افلم یسیروا فی الارض فلینظروا
کیف کان عاقبة الذین من قبلهم ..)
یوسف / ١٠٩ . واتە :
ئایا بە زەوی دا نەگەڕاون تا سەرنج
بدەن داخوا سەرەنجامی ئەوانەی پێش
وان چۆن بووە .. ؟!
وە لە کۆتاییدا خوای بەرزو مەزن
داوامان لێدەکات کە لە هەموو وردو ..
درشتی بوونەوەرەوە ڕابمێنین و سەرنجی
هەموو شتێک بدەین :
١٠ ـ ( اولم ینظروا فی ملکوت السموات
والارض وما خلق الله من شیء ....)
الاعراف / ١٨٥ .
ئیجا پوختەی ئەنجامی ئەو
تێوەڕامان و سەرنجدان و وردبوونەوەیەش

که ڕێبازی پێغەمبەر فەرمانی پێ دەکات دەگونجێ لە (٣) خاڵان دا بخرێتەڕوو :

١- سەرلەبەری بوونەوەر بە وردو درشتی یەوە بەپێی بەرنامەو نەخشەیەکی یەکجار وردو سەرسوڕهێنەر دروست کراوەو، هەمووی بەگوێرەی چەندەها یاسای ڕێک وپێک و ژیرانە بەڕێوەدەچێ و هێندەی نووکی دەرزی ناڕێکی و بێ یاسایی لە بوونەوەردا نابینرێ ، وەک خودا فەرموویەتی :( .. ما تری فی خلق الرحمن من تفاوت فارجع البصر هل تری من فطور . ثم ارجع البصر کرتین ینقلب الیک البصر خاسئا وهو حسیر ) الملک / ٤-٥ . واتە :

لە دروستکراوی خوادا هیچ ناڕێکی بەدی ناکەی ، چاوبگێڕە بزانە هیچ کەلێنان دەبینی،! دوایی جار لەدوای جار چاو بگێڕە ، سەرەنجام چاوت بە دەرکراوی و ماندووەتی دەگەڕێتەوە لات!!

٢- مادام بوونەوەر هەمووی بەپێی نەخشەو بەرنامە بەڕێوە بچێو هیچی وای تێدا نەبێ کە بە گۆترەکاری دروست کرابێ، دیارە ژیانی دنیاش - واتە ژیانی مرۆڤ لەسەر خڕۆکەی زەوی- کە بەشێکە لە بوونەوەر، هەر بە گوێرەی نەخشەو بەرنامەیەک و بەپێی حیکمەت و فەلسەفەیەکی بەرز ڕەخسێنراوەو، بە هەوەنتە پەیدانەبوە.

وەک خودا فەرموویەتی: ( افحسبتم انما خلقناکم عبثا ..) المومنون /١١٥ .

واتە : ئایا پێتان وایە کە بە گاڵتە- خوڵقاندوومانن .. !!

دیسان فەرموویەتی: ( الذی خلق الموت والحیاە لیبلوکم ..) الملک /٠٢.

واتە : ئەوەی کە مردن و ژیانی دروست کردوە، تاکو تاقیتان بکاتەوە..

٣- ئینسان کە سەرتۆپی کائیناتەو لە چاکترین شێوەدا دروست کراوەو بە مەبەستی تاقیکرانەوەو هەڵسەنگێنران

لەسەر زەوی ڕۆنراوەو ژیان و مردنی بۆ دیاری کراوە، شتێکی یەکجار دوورو ناماقووڵە کە بە هەوەنتەو بێ حیکمەت دروست کرابێو، بەس ئەوەندە ژیانە کەمەی دنیاشی پێ ڕەوا دیترابێ!

٥/ جۆرە ئەنجامگیری یەك لەم

## جۆرە تیڕوانینە دەکرێ ؟!

دەتوانین ئەنجامگیری ( استنتاج ) یەک کە لەم جۆرە تیڕوانین و بیرو بۆچوونە دەکرێ لە چەند خاڵێک دا بخەینەڕوو :

یەکەم : پشت بەستن بە پێنج هەستەکان لە بواری دەستەڵاتیان دا :

( ڕێبازی پێغەمبەر ) صلی الله علیه وسلم بە پێچەوانەی حاڵی بوونی زوربەی نائیسلامیەکان نەک هەر ڕێگە بە شوێن کەوتووانی دەدات کە لە قەڵەمڕەوی جیهانی بەرهەست دا پشت بە پێنج هەستەکان ببەستن بۆ پەی پێ بردن و ناسینی دەوروبەر، بەڵکو فەرمانیشیان پێ دەکات و وەک نوێژو ڕۆژوو لەسەریان پێویست دەکات .

دووەم : بەلاّم ڕێبازی پێغەمبەر فیتووێ بە برای بێ لێو ناسپێرێ و هەر کەسەو هەر شتە لە بواری توانـــا و دەستەلاّتی خۆی دا بەکاردێنێ، بۆیە ئەو ئەزموون و بەرهەمو دەستکەوتەی کە لە ڕێ ی پێنج هەستەکانەوە دەستگیر دەبێ ناچێ وەک ئەزموونییەکان( التجریبیون) بیکاتە سەنگی مەحەک و تاقە ڕێ ی ناسینی دەوروبەر، بەڵکو بڕوای بە عەقڵ و بیرکردنەوەش هەیەو، دەڵێ بەبێ بەکارهێنانی عەقڵ لە چەند شارەزاییەکی سادەو سەرکێڵ پتر ناتوانین بەولاوەتر بڕۆین ،(١) لە بواری ناسینی دەوروبەردا .

سێ یەم : بەلاّم ڕێبازی پێغەمبەر بەو قسەیەی فەیلەسووفەو

---

(١) لە بەرگی یەکەمی کتێبی(گەورەترین ڕاستی)دا بەدرێژی بەرپەرچی بیردۆزەی ئەزموونییەکان دراوەتەوە .

فیکری یەکانیش قایل نابێ، کە گوایە عەقڵ تاقە هۆی ناسینی دەوروبەرەو، مرۆڤ جگە لە عەقڵ و هۆش هیچ هێزێکی دیکە شک نابات بۆو مەبەستە، بەڵکو دەڵێ هەروەک چۆن جوغزی دەستەڵات و قەڵەمڕەوی پێنج هەستەکان سنووردارو دیاری کراوە، عەقڵیش بەهەمان شێوە، بەس لە بوارێکی تایبەتیدا دەتوانێ ئەسپی خۆی تاوبدات و لە فریای ئینسان بێت، وە مەیدانێکی زۆر فراوان دەمێنێتەوە کە عەقڵ دەستی ناگاتێ و، لە ڕێ یەکی دیکەوە دەتوانین خۆمانی بگەیەنینێ کە ڕێ ی دڵ ( قلب ) ە[1] !!

بۆ وێنە پێغەمبەرمان لەوبارەوە فەرموویەتی ( لولا ان الشياطين يحومون على قلوب بني آدم لنظروا الى ملكوت السماء ) رواه احمد عن ابي هريره .

---

(١) لە بەرگی یەکەمی کتێبی ( گەورەترین ڕاستی)دا لەژێر سەرباسی (چاکترین ڕێ ی خواناسین) دا ئەو باسە بە تێروتەسەلی توێژراوەتەوە .

واته: ئەگەر شەیتانەکان دەورەی دڵــی ئادەمیزادانیان نەدابا، بێگومـــان ـ بە چاوی دڵیان ـ دەیان ڕوانیە ملکی ئاسمان. ( واتە خوتخوتەی شەیتـــان ئاوێنەی دڵی ئینسان لێڵ و چڵکن دەکات دەنا ڕازو نهێنییەکانی پێ دەدیتن ).

چوارەم: لەمەشەوە کە ڕابرد دەرکـەوت کە هەم ئەوانەی تۆمەتــــی ئایدیالیزم ( مثالیە ) پاڵ دەدەنـــە لای ڕێبازی ئیسلامو، هەم ئەوانەی کە لـــە بەرگی ئیسلامدا وا پێشـــان دەدەن بڕوایان بە زانیاری و ئەزموون نیە، هەردووکیان بەهەڵەدا چوون.

کەواتە:

هەرکەسێک خۆی بە شوێن کەوتـــووی ڕێبازی پێغەمبەر دادەنێ، با فەرمانی خوا جێبەجێ بکاتو پێنج هەستەکانی و بیروهۆشیو دڵ و دەروونی هەریەکە لـــە بواری خۆی دا بەکاربێنێ بۆ ناسینـــی دەورووبەرو وەدەست هێنانی بیروبۆچوونی

تێڕوانینێکی ڕاست و دروست دەربارەی بوونەوەرو ژیان و ئینسان و ، باگادار بێ بەهیچ جۆرێک دووچاری دەردی کوشندەی لاساکردنەوەی کوێرانە نەبێ .

## بەندی دووەم
## بیروباوەڕێکی ئیسلامی یانە

( بیروباوەڕی ئیسلامییانە ) دووەمین بنەڕەت و هێڵی گشتی ( ڕێبازی پێغەمبەر )ە و ئەنجام و بەرهەمی سروشتی (تێڕوانینێکی ژیرانە ) ی بوونەوەر و ژیان و ئینسانیشە، چونکە :

یەکەم: بەپێی هەرکام لە یاسای هۆکاری ( قانون السببیة ) و یاسای ڕێک و پێکی ( قانون النظام ) و چەندان یاسای دیکەی عەقڵی پتەو، بوونەوەری ڕێک و پێک و یاسادار ( منظم ) حەوجێی بە خودایەکی بەدیهێنەرو ڕێکخەر هەیە و ناگونجێ لەخۆڕا و بێ کارساز و مشوورگێڕێکی بەرز و مەزن و زانا و توانا و میهرەبان و کاربەجێ پەیدا بێ . (1)

(1) هەرکام لە یاسای هۆکاری و یاسای ڕێک و پێکی و چۆنیەتی سەلماندنی بوونی خوا، بەهۆی ئەم دوو یاسایەوە لە بەرگی یەکەمی کتێبی ( گەورەترین ڕاستی ) دا لێکۆڵینەوەی خەست و خۆڵیان لەسەر کراوە

ئنجا ویڕای ئەمەش عیشقو تینوو ایەتی (دڵ) ی ئینسان بۆ خواو دیداری پیرۆزی بەهێزترین بەڵگەی هەبوونی خـــــوای پەروەردگارە، چونکە مەحاڵ و ناماقووڵە سروشت و ویژدانی ئینسان هەر لـــــە بەرەبەیانی مێژووەوە هەتا ئێستــــا بەهەڵەدا چووبێ و، وەدوای کڵاوی بابردوو کەوتبێ تینوو و عەوداڵی شتێکی نەبـــوو (معدوم) بووبێ!!

دووەم: ئنجا بڕواهێنان بە خـــــوای پەروەردگار یەکسەر پەلکێشمـــان دەکات بۆ مەسەلەی بڕواهێنان بـــــە پێغەمبەرایەتی (نبوة) پێغەمبــــەران علیهم الصلاة والسلام، چونکە خوایـــەک هێندە زاناو تواناو لێزان و میهرەبان بێ بەرنامەو پەیڕەو بۆ وردو درشتـــی بوونەوەر دابنێ و، هیچ شتێک فەرامـــۆش نەکات، وای لێ چاوەڕوان دەکرێ کـــە ئینسانیش پشت گوێ نەخات و لــــــە ڕێڕوونیو بەرنامەی خۆی بێبەشی نەکات.

سێیەم: ئنجا بڕوا بەخوا هێنان و بڕوا بە پێغەمبەران هێنانیش بێ سێ دوو ناچارمان دەکەن کە بڕوا بە ڕۆژی دوایی بێنین، چونکە :

١- لە بەخشش و لوتفی فراوانی خوا بەدەر ئەوەندە چاوەڕوان ناکرێ کە مرۆڤ هەر ئەوەندە ژیانە کەم و پڕ گیرو گرفت و دەردەسەری یەی بە بالا بڕابێ.

٢- ئەو بەرنامەو پەیرەوەی کە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هێناویانە فەرمان دەکات بە کردنی چاکەو ڕێگری دەکات لە کردنی خراپە وە موژدەو هەڕەشەی تێدایە بۆ هەرکام لە چاکەکاران و خراپەکاران، مادام وابێ دەبێ قۆناغ و مەیدانێکی دیکە هەبێ کە ئەو موژدەو هەڕەشانەی خوای تێدا بێنەدی .

جا مسوڵمانی بەڕێز !

ئەم سێ خاڵەی خرانەڕوو سێ بنچینەو پایەی هەرەگرنگ و پێویستی

بێ ئاگا بین :

یەکەم: کە دەمەرموێ قورئان هەموو شتێکی تێدایەو هیچ شتێکی پشت گوێ نەخستوە، مەبەست یاساو دەستوورە گشتیو سەرەکییەکانن ، نەک هەموو وردە بابەتەکان .

دووەم : هەموو کەسیش ناتوانێ یاساو دەستوورە گشتیو بنەڕەتییەکانیش لە قورئانێ هەڵێنجێو، ئەویش باباى خۆی دەوێ .

٢- لەدوای قورئان سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دووەمین سەرچاوەی ڕوون و باوەڕپێکراوە کە شوێن کەوتووی ڕێبازی پێغەمبەر بیرو باوەڕی خۆی لێ وەردەگرێ ، بەلام سەبارەت بە (سوننەت ) پێویستە چەند ڕاستییەک لەبەرچاو بگیرێن :

زاناو تواناش لەبارەی پارێـــــزراوی قورئان لە دەستکاری کران و کەمو زیـادی فەرموویەتی: ( إِنَّا نَحنُ نَزَّلْنا الذِّكرَ وإِنَّا لَه لَحافظون ) الحجر/ ٩ . واتە : ئێمە خۆمان قورئانمان ناردوە، وە ئێمە بۆخۆشمان پارێزەرینی ..

وە .لەبارەی تێروتەواوی و بێ هەڵــەو پەڵەییەوە فەرموویەتی: ( وَتَمَّتْ كَلِمَـــــةُ رَبِّكَ صِدقاً وَعَدلاً ) الأنعام/ ١١٥ . واتە : وە قسەی پەروەردگارت لەوپەڕی ڕاستی و ڕێکی دایە .

دیسان فەرموویەتی: ( ما فَرَّطْنا فـــي الكِتابِ مِن شيءٍ ..) الأنعام/ ٣٨ . واتە: لەم کتێبەدا هیچ شتێکمان فەرامـــۆش نەکردوە ..

هەروەها فەرموویەتی: ( وَنَزَّلنا عَلَيكَ الكتابَ تِبياناً لِكُلِّ شيءٍ ..) النحل/ ٨٩. واتە: وە ئەم کتێبەمان ناردۆتە سەر تۆ بۆ ڕوونکردنەوەی هەموو شتێک ..

بەڵام لێرەدا نابێ لە دوو ڕاستی یان

یەک : "سوننەت" کە بەقسەو کـــردەوەو بـڕیـار [1] لەسەردراوەکانـــی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم دەگوترێ وەک قورئان نیە هەمووی بێ مشـــت ومڕ وەربگیرێ ، بەڵکو بۆ وەرگرتنی هــەر شتێک لە هەرکام لە سێ بەشەکانـــی سوننەت دەبێ دوو مەرج هەبن :

آ ـ نابێ لەگەڵ یاساو بنچینـــه گشتیەکانی قورئان دا دژایەتـــی هەبێ، چونکە ئەرکی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم بریتی بووە لە ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی قورئان ، واتە سوننەتـی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم شەرح و لێکدانەوەی قورئانەو لەبەر تیشکـــی قورئان دا هاتۆتەدی ، دیارە مەحاڵیشە

---

(1) مەبەست لە بڕیارلەسەردراوەکـــان ( التقریرات )ی پێغەمبەر ئـــەو مەسەلانەن کە بۆخۆی ڕاستەوخـــۆ نەیفەرموون و نەیکردوون ، بەڵکـــو یەکێک بە ئاگاداری وی گوتوونی یـــان کردوونی‌و ، ئەویش ڕازی بووبـــێ و بەرپەرچی نەدابێتەوە .

پێغەمبەر شتێک بفەرموێ دژی قورئان بێ
یان لەگەڵی نەگونجێ، کەواتە هەر شتێک
ـە سوننەتی رابەرمان صلى الله عليه وسلم
ـەگەڵ قورئان دا دژایەتی هەبێ و بە هیچ
جۆرە (تأویل)ێک لەگەڵی رێک نەکەوێ،
ا چارین رەتی بکەینەوە و بڵێین: ئەمە
ەرچەندە رەگەڵ سوننەتی پێغەمبەرمان
ەوتوە، بەڵام لەوی نیە.
پوختەی قسان ئەوەیە کە قورئانی بەپێز
ەسەر سوننەتدا چاودێرە و، سوننەت هەر
ێندە ئیعتیباری پێ دەکرێ تا قورئان
ایەدی ی بۆ دەدات[1] بەڵام نابێ لەوەش
ێ ئاگا بین کە هەموو کەس توانای ئەوەی
یە کە بەراورد لەنێوان قورئان و
وننەتدا بکات و بە بیروبۆچوونی خۆی
وکم بەسەر سوننەتدا بدات، بەڵکو تەنیا
ەسانێک ئەو کارەیان لەوزەدایە کە
رەزایی قووڵ و فراوانیان دەربارەی
رئان و سوننەت و (أصول الفقه) هەبێ،
ونکە نەک هەر لەم بارەوە بەڵکو لە هیچ

---

(۱) بروانە (الدولة القانونية والنظام
سياسي الأسلامي) ...
. منير حميد البياتي.

بابەتێک دا جگە لە زانایانی پسپۆڕو شارەزا کەس مافی بڕیاردەرکردنی نیە .

ب ـ مەرجی دووەمی وەرگرتنی سوننەت

ئەوەیە کە دژی عەقڵی ساغو زانیاری ڕاست نەبێو ، ئەگەر لانی کەم بە ڕوالەتیش لەگەڵیان نەگونجێ، بە تەئویلێکی ڕاستو شەرعی بسازێ و ڕێک بکەوێ .

هەڵبەتە بۆیەش ئەم مەرجەمان لە قوڕئان دا بەمەرج نەگرت ، چونکە ئێمە لە ڕێ یەکی ڕاستو متمانەپێکراوەوە گەیشتووینە دڵنیایی تەواو کە قوڕئان هەمووی قسەی خوایەو بە ڕاستو دروستی بەئێمە گەیشتوە ، بەڵام ئەم دڵنیایی و قەناعەتەمان لەبارەی سوننەتەوە بۆ نەڕەخساوە .

دوو : " سوننەت " وەک قوڕئان نیە کە هەمووی لە یەک پلە ( درجە ) دا بێ

چونکە قوڕئان هەمووی لە ڕێ یەکی متمانەپێکراوی دوور لە گومان و

دووودڵیەوە بە ئێمە گەیشتوە کە لـە زاراوی شەرعدا پێی دەگوترێ ( طریقـە التواتر ) ، بەڵام سوننەت ئەندازەیەکی کەمکەمی نەبێ ( متواتر ) [1] نیە ، جـا گومانی تێدا نیە کە بەڵگەهێنانـەوە ( استدلال ) بە سوننەت بۆ ئیسپاتی هەر حوکمێکی شەرعی بەگوێرەی جیاوازی نێوان جۆرەکانی سوننەت فەرق دەکات ، بۆ وێنە بۆ ئیسپاتی شتێک لە ( فضائل ) [2]

---

(١) ( متواتر ) لە زاراوی ( علم الحدیث ) دا بەو جۆرە سوننەتە دەگوترێ کە کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر خوا لێیان رازی بێ بۆ وەچە ( جیل ) ی دوای خۆیان نەقڵیان کردبێ و ئەوانیش بەهەمان شێوەو هەروا بە زنجیرە ، دیارە هەواڵێکیش ئاوا بە ئێمە گەیبێ لەرووی ( سند ) ەوە لە ریزی ئایەتان دایە .

(٢) ( فضائل ) کۆی ( فضیلە ) بە هەر کردەوەو خەسڵەتێکی پەسندو شەرعی دەگوترێ ، بەڵام لێرەدا مەبەست لەو ئاداب و سوننەتانەیە کە لە بواری رەوشت و هەڵس وکەوت و زیکرو .. هتد دا لە پێغەمبەرەوە گێڕراونەوە .

www.alibapir.net

فەرموودەی بێ هێز ( ضعیف[1] ) یش بەڵگە دەشێ، بەڵام بۆ ئیسپاتی حوکمێکی شەرعی حەوجێمان بە سوننەتێکی ڕاست ( صحیح )[2] یان لانی کەم چاک ( حسن[3] ) هەیە، خۆ ئەگەر بێت و حوکمە

---

(١) ( ضعیف ) لە زاراوی فەرموودەناسان ( محدثین) دا بەو جۆرە فەرموودانە دەگوترێ کە مەرجەکانی (صحیح )و (حسن)یان تێدا نەهاتبنەدی ، ئەویش سێ بەشە ١- هەڵبەستراو ( موضوع ) ،٢- هەڵگەڕاوە (مقلوب ) ،٣- نەزانراو (مجهول ) ، وە شایانی باسە کە هەموو جۆرەکانی (ضعیف ) تەنانەت لە بواری (فضائل)یشدا دروست نیە ئیشیان پێ بکرێ ،

(٢) ( صحیح ) بەو جۆرە فەرموودانە دەگوترێ کە لە ڕێ ی زنجیرە راوی یەکی دادگەر ( عدل ) ی پێکەوە پەیوەستەوە لە پێغەمبەرەوە بە ئێمە گەیشتبێ .

(٣) ( حسن ) ئەوەیە کە راوی یەکانی ناسراوبن و پێکەوە پەیوەست بن بەڵام وەک راوی یەکانی ( صحیح ) تەواو نەبن ، یان لە لایەکی دیکەوە ناتەواوی هەبێ .

بڕوانە :( صحیح مسلم بشرح النووی) ج ١ ص ٢٧ .

شەرعی‌یەکە لە بواری بیروباوەڕدا بــێ
ئەوە بەبێ سوننەتێکی ( متواتر ) ئــەو
مەبەستەمان بۆ نایەتەدی ، چونکـــــــە
مەسەلەی بیروبڕوا پێویستە مرۆڤ تێیدا
لە گومان و دوودڵیدا نەبێو بگاتــــــە
دڵنیایی‌و دڵ دامەزرانی تەواو ، دیــارە
مرۆڤیش بە بەڵگەی ( ظنی) ناگاتــــــە
پلەی یەقین و قەناعەتی تەواوو دەبــێ
بەڵگەی یەقینی لەدەستدا بێ .

٣- ئنجا لەپاش سوننەتی پێغەمبەر صلی
الله علیه وسلم سێیەمین سەرچاوەی
شوێن کەوتووی ڕێبازی پێغەمبەر ئەو
بەرهەمو کەلەپوورە ڕەسەنەی زانایانـــی
میراتگری ڕاستەقینەی پێغەمبەرە کـــە
لەبەر تیشکی قورئان و سوننەتدا بە
دڵی بێدارو زەینی ڕوونیان بۆ شـــەرحو
لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی دەقەکانی
قورئان و سوننەت خستوویانەتـــەڕوو و
لە یاساو بنچینە گشتی‌یەکانی ئیســــلام
هەڵیان هێنجاوە .

بەڵام لێرەشدا دەبێ چەند ڕاستی یەک بخرێنە ڕوو :
آ ـ بێجگە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هیچ کەس ە هەڵە پارێزراو (معصوم) نیەو، هیچ کەس هەموو شتێکی بێ سێو دوو لێ وەرناگیرێ ، ئیمامی مالیک لەوبارەوە گوتوویەتی :
( کل احد يُؤخذ من قوله ويُرَدُّ عليه الا صاحب هذا القبر صلى الله عليه وسلم)(١) .
کەواتە : هیچ کەس بۆی نیە بڵێ هەرچی زانایانمان خوا لێیان خۆش بێ فەرموویانەو بەرهەمیان هێناوە هەمووی هەر ڕاستەو هیچی هەڵەی تێدا نیە ، چونکە کە وامان گوت هیچ جیاوازی یەکمان لەنێوان پێغەمبەرو زانایاندا نەهێشتوتەوەو، قورئان و سوننەتی ڕاستی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و بەرهەمو کەلەپووری زانایانمان

---

(١) بروانە ( كشف الخفا ومزيل الالباس ) ج٢ ص ١٥٥ .

لە ڕیزێک دا داناوە !! دیارە ئـــەمەش شتێکی هەڵەو تاوانە چونکە بـــەدەردی زاناو چاوساغەکانمان فەرموویانە :
( قد ضمن الله لی العصمە فی القـــرآن والسنە ولم یضمنها لی فی سواهمـــــا )
واتە : بێگومان خوا دڵنیای کردووم کە قورئان و سوننەت بە هەڵەدا ناچـــن، بەلاّم لە غەیری وان دا کەفالەتی ئەوەی نەکردووم !!
ب ـ کەواتە هەر قسەو بڕیارێکـــــــــی زانایانمان بەس بە ئەندازەی نیزیکی لە قورئان و سوننەتەوە متمانەی پـــێ دەکرێ و جێی ئیعتیبارەو، هەر قســـەو بڕیارێک هەرچەندە خاوەنەکەی گـــەورە بێت، مادام لە دادگاو تـــــەرازووی قورئان و سوننەت دا ڕاست و ســــــاغ دەرنەچێ، ئەوە بەبێ دڵ لەدڵ دان .... وەلادەنرێ و، دەگوترێ :
هەرچەندە خاوەنەکەت گەورەو پایـــــە بەرزەو جێی ڕێزو حورمەتە، بەلاّم مادام

بۆخۆت ڕاست و تەواو نیو تورئان و سوننەت شایەدیت بۆ نادەن ، ناتوانم وەرت بگرم و کورد گوتەنی :( کەس بە مەلەی بابی ناپەڕێتەوە ) و ( ئەگەر بۆخۆت کۆسە بی ڕیشی بابت بەتۆ چی[1]!) .

ئاگاداری :

ئەوە کە لەبواری( فضائل ) دا سوننەتی( ضعیف ) یش بەمەرجێک(موضوع ) نەبێ کاری پێدەکرێ ، بەڵام بۆ حوکمە شەرعیەکان پێویستیمان بە سوننەتی ( صحیح ) یان لانی کەم ( حسن ) هەیە ، قسەی تێکڕای زانایانە وەک ( نووی ) لێیان نەقڵ دەکات .[2]

---

(١) لە بەندی دووەم و سێیەمی بەشی دووەمدا چاکتر ئەم مەسەلەیە دەتوێژینەوە ، وە لە ئاڵقەی پێنجەمی زنجیرەی ( با چاکتر ئیسلام بناسین١ )دا مەسەلەی(بروا ) بەدرێژی لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە .

(٢) بڕوانە ( الاذكار ) ص ٧ . نووسراوی ( نووی ) .

چ جۆرە ئەنجامگیری یەك لەم جۆرە

بیروباوەرە دەکرێ ؟!

دەتوانین لە چەند خاڵێک دا بەکورتی ئەنجام و بەرهەمەکانی بیروباوەڕی ئیسلامییانە کە دووەمین بنەڕەت و هێڵی گشتی ڕێبازی پێغەمبەرە بخەینەڕوو :

یەکەم : بڕوا بەخواهێنان و (١) خۆشتر ویستنی لە هەموو کەس و هەموو شتێک ، چونکە خوایەک خاوەنی ئەوپەڕی بەرزیو مەزنیو گەورەییو پاکیو چاکیو بەخشش و لوتف و بەزەییو هەموو سیفەتێکی دیکەی چاک بێ ، دیارە شایستەی ئەوەیە کە مرۆڤ ئەوپەڕی خۆشەویستیو شەرمو ڕێزو گەردن کەچی بۆی هەبێ .

---

(١) ئاڵقەی یەکەمی زنجیرەی ( با چاکتر ئیسلام بناسین ! ) تەرخان کراوە بۆ توێژینەوەی ئەم بابەتە .

خوداش فەرمووویەتی : ( والذین آمنوا اشد حبا لله ..) البقره/ ١٦٥ .

دووەم : بڕواهێنان بە پێغەمبەران[(١)] بەگشتیو ( محمد ) بەتایبەتی علیهم الصلاه والسلام، وە هەبوونی ئەوپەڕی ڕێزو حورمەت و خۆشەویستی سەبارەت بە هەموویان بەگشتی و سەروەریان ( خاتم النبیین ) بەتایبەتی . پێغەمبەریش فەرموویەتی : ( لایؤمن احدکم حتی اکون احب الیه من والده وولده والناس اجمعین ) رواه الشیخان. واتە : یەکێکتان بڕوا نایەنێ هەتا منی لەلا خۆشەویستتر نەبێ لە بابی و ڕۆڵەی و تێکڕای خەڵکی .

سێیەم : بڕواهێنان بە ڕۆژی[(٢)] دوایی و،

---

(١) ،(٢) ئاڵقەکانی دووەمو سێیەمی زنجیرەی ( با چاکتر ئیسلام بناسین ١) تەرخان کراون بۆ توێژینەوەی ئەو بابەتانە .

لێ ترسان و خۆبۆ ئامادەکردنی، دیارە لێ ترسان و خۆئامادەکردنی سرۆڤیش بۆ ڕۆژی لێپرسینەوەو پاداشت و سزا بە ئەندازەی پتەوی و کزی بڕوا پێ بوونی یەتی .

چوارەم : بڕوا بە قورئان و سوننەت هەبوون و پرس پێ کردنیان و پێوە پابەندبوونیان لە هەموو وردو درشتی ژیانی تاکی و کۆمەڵیدا ، خوداش فەرموویەتی :( یا ایها الذین آمنوا لاتقدموا بین یدی الله ورسوله واتقوا الله ان الله سمیع علیم )الحجرات/١ .
واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە - هیچ شتێک - وەپێش دەستی خواو پێغەمبەرەکەی مەخەن ، وە پارێز لە خوا بکەن ، بێگومان خوا بیسەرو زانایە .

تێ بینی :
( تُقَدِّمُوا ) ش خوێنراوەتەوەو ،

( تَقَدَّموا ) ش ، ئەگەر شێوە خوێندنەوەی یەکەم بگرین دەبێ بڵێین :
بەرکار ( مفعول ) ی ( تقدموا ) لابراوە بوئەوەی زەین بۆ هەموو شتێک بچێ لە هەر جۆرە قسەو کردەوەو هەڵوێست و ڕەفتارێک ، واتە : بابای مسوڵمان بۆی نیە بەبێ بڕیارو فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم یەک تاقە شەقاو هەڵێنێ .
وە ئەگەر خوێندنەوەی دووەم هەڵبژێرین ئەوە دەڵێین :
( تقَدَّموا ) لە ئەسڵ دا ( تتقَدَّموا ) بووەو ، ( تا ) یەکیان لابراوە ، ئەو کاتەش ماناکەی ئاوای لێ دێ :
ئەی ئەوانەی بڕوتان هێناوە وەپێش خواو پێغەمبەرەکەی مەکەونەوە ...
هەڵبەتە وەپێش کەوتن ( تقدم ) یش لە خواو پێغەمبەر ڕواڵەتەکەی مەبەست نیەو درکە ( کنایە ) یە بۆ لە سنوور دەرنەچوون و ، بەبێ بڕیاری خواو

پێغەمبەر نەجوولاَن . (١)

پێنجەم : بەچاوی ڕێزو حورمەتەوە تەماشاکردنی زاناو چاوساغانی میراتگری ڕاستەقینەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ، خوا لێیان خۆش بێ ، وە دووعای خێر بۆکردنیان و بەڕێزەوە ناوبردنیان ، وە خۆپاراستن لە بێ ئەدەبی نواندن و گومانی بەد پێ بردنیان ، کە دواتر چاکتر ڕوونی دەکەینەوە .

(١) دەتوانی بۆ زیاتر حالّی بوون لە مانای ئەو ئایەتە بەپێزە سەرنجی ئەم تەفسیرانە بدەی :
آ- ( الجامع لاحكام القرآن ) للقرطبي ج ١٦ ص ٣٠٠ .
ب- ( انوار التنزيل واسرار التأويل ) للبيضاوي / ج ٢ ص ٤٠٦ .
ج- ( الميزان ) محمد حسين الطباطبائي ج ١٨ ص ٣٠٧ .
د- ( فتح القدير ) للشوكاني ج ٥ ص ٥٨ ، ٥٩ .

شه‌شه‌م : شه‌شه‌مین ئه‌نجامگیری كه‌ له‌ ( بیروباوه‌ڕێكی ئیسلامی یانه‌ ) ده‌كرێ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ :

ئه‌و كه‌سه‌ی خۆی به‌ شوێن كه‌وتووی ( ڕێباز‌ی پێغه‌مبه‌ر ) صلی الله علیه وسلم ده‌زانێ‌و ، ده‌یه‌وێ له‌ڕیزی ئۆممه‌تی موحه‌ممه‌د بژمێررێ ، پێویسته‌ له‌ هه‌موو وردو درشتێكی‌دا ( ئیسلامی ) بێ به‌ مه‌عنای وشه‌ :

١- جگه‌ له‌ خودا ( الله ) كه‌ ئیسلام به‌ تاقه‌ خوای ڕاسته‌قینه‌ی داناوه‌ ، هیچ كه‌س‌و هیچ شتێكی دیكه‌ نه‌گرێ به‌ خوا نه‌ شه‌یتان نه‌ نه‌فسی خۆی نه‌ سامان نه‌ ئافره‌ت نه‌ طاغووت نه‌ نیشتمان نه‌ حیزب .. هتد .

٢- جگه‌ له‌ موحه‌ممه‌د كه‌ ئیسلام به‌ تاقه‌ ڕابه‌رو چاوساغی ڕاستی مرۆڤایه‌تی داناوه‌ ، هیچ كه‌سێكی دیكه‌ نه‌كاته‌ ڕابه‌رو مشوورگێڕی خۆی ، مه‌گه‌ر قوتابی‌و شاگردو میراتگری وی بێ .

٣- جگه له قورئان كه ئیسلام به تاقـــه كتێبی بێ هەڵەو پەڵەی دانـــاوه، هیچ كتێبێكی دیكه نەكاته بەرنامـــەو پەیڕەوی بێ چەندوچوونی ژیانی .

٤- جگه له سوننەت و ڕێ و شوێنـــــی پێغەمبەرمان موحەممەد صلی الله علیه وسلم كه له ڕوانگەی ئیسلامەوه به تاقه ڕێ و شوێنی ڕاست دادەنرێ ، ڕێ وشوێنی هیچ كەسێكی دیكه نەكاته سەرمەشـــق مەگەر لەو دەریا بێ سنووره ..... هەڵهێنجرابێ .

٥- جگه له كابە ( كعبه ) كه ئیسلام بـــه تاقه ڕووگه ( قبله ) ی مسوڵمانانـــی داناوه، ڕووی دەرو دەروونی نەكاتـــه هیچ شوێنێكی دیكه، نه كۆشكی سپـــی نه كرملین ، نه پەكین ، نه پاریـــس، نه لەندەن .. هتد .

٦- جگه لەو سەروسیماو عادەت و نەریتەی كه ئیسلام بڕیاری داوه، توخنی هیـــچ جۆره سەروسیماو نەریتێكی دیكه نەكەوێ.

٧- بەکورتیو بەکوردی دەبێ شوێن کەوتووی ڕێبازی پێغەمبەری خوا بێ ، صلی الله علیه وسلم لە فیکردا ئیسلامی بێو لە خوو و ڕەوشتدا ئیسلامی بێو لە شۆڕش و تێکۆشانیدا ئیسلامی بێ و ، - تەنانەت لە ڕەنگ و دیمەن و سەرو سیماشیدا هەر ئیسلامی بێ، چونکە فەرموودەی ( من تَشَبَّهَ بقوم فهو منهم ) رواه ابوداوود (١) ، هەموو لایەنێک دەگرێتەوە ، سیاسەت و عیبادەت ، دەروەدەروون ، وردو درشت ، تاک و کۆمەڵ .

حەوتەم : حەوتەمین ئەنجامێکی کە لە بیروباوەڕی ناوبراو دەکیرێ ، ئەوەیە کە شوێن کەوتووی ڕێبازی موحەممەد صلی الله علیه وسلم لە هەموو جۆرە وردو درشتەکانی

---

(١) بروانە ( فیض القدیر شرح الجامع الصغیر ) ج ٦ ص ١٠٤ ، ژمارە (٨٥٩٣) .

ھاوبەش پەرستی( شرک ) دوور دەبــــێو نە لەژێر پەردەی دینداری مەعنــەوی دا دووچاری ( شەخس پەرستی ) دەبــێ ، وە وە نە لەژێر پەردەی دنیاداری سیاسیدا گیرۆدەی داوی فێڵبازانی مەیدانـــــی سیاسەت دەبێو ، دەیکەنە کۆیلەی خۆیانو خزمەتکاری ئارەزووەکانیان ، بەڵـــێ باباى ( ئیسلامی) لە سایەی خواپەرستیو پێغەمبەردۆستیو ، دەستگرتنی یەوە بە ڕێسمانی خواوە بە مەعنای وشە دەبێتە یەکتاپەرست ( مُوَحِّد ) و بەشی غەیــــری خوای پیۆەنامێنێو بە زمانی حـــــاڵ ( ان صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي للــه رب العالمين ) دەکاتە درووشمی خۆی .

ئێستاش دەچینەسەر بەندی سێ یـــەم ( خواپەرستیەکی سالحانە ) کــــــە ئەنجامو بەرھەمی سروشتیو مسۆگـــەری ( بیروباوەڕێکی ئیسلامیانە ) بە ...

## بەندی سێیەم
## خواپەرستی یەکی سالحانە

وەک لەپێشەوە گوتمان خواپەرستی و بەندایەتی بۆ خوا کردن ئەنجام و بەرهەمی مسۆگەرو چاوەڕوان کراوی بیروباوەڕی ئیسلامییانەیە، چونکە :.
یەکەم: وەک لە بەشی دووەمی کتێبی ( مسولمانی کامڵ )دا [1] بە تێرو تەسەلی ڕوونمان کردۆتەوە وشەی(عبادە) کە لە ئەسڵی زمانی عارەبیدا بە مانای گەردن کەچیو فەرمانبەری دێ، لە ڕوانگەی [2] شەرعەوە یانی خواپەرستی و گەردن بۆخوا کەچکردن، وە زاناو لێکۆلەرەوان ( محققین ) یش فەرموویانە :

---

(١) ( مسولمانی کامڵ) ئاڵقەی دوازدەیەمی زنجیرەی ( با چاکتر ئیسلام بناسین ) ە .
(٢) لێرەدا وشەی(شەرع ) ماناو چەمکێکی فراوانتر لە مانای( فقە ) ی تێدا ڕەچاوکراوە .

خواپەرستیو گەردن بۆخوا کەچکردن دوو بنچینەو پایەی هەن کە بەبێ هەبوونی هەردووکیان نایەتەدی ، یەکەم : ئەوپەڕی خۆشویستن . دووەم : ئەوپەڕی بەگەورەگرتن ( تعظیم ) .

ئنجا گومانی تێدا نیە کە هەرکەسێک بیروبڕوا ( عقیدە ) یەکی ساغی ئیسلامییانەی هەبێو بەپێی لێوەشاوەییو توانای خۆی خوا بناسێو بە زاتی بێ وێنەی و ، خەسڵەتە بەرزو پەسندەکانیو ناوە چاکەکانیو ، کردەوە بەجێیەکانیو قسە ڕاستو تەواوەکانیو ، بەرنامە بێ هەڵەو پەڵەکانیو ، دروستکراوە ڕێکو پێکەکانی ئاشنا بێت ، حەتمەن حەتمەن ئەوپەڕی ڕێزو شەرموخۆشەویستیو ئەوپەڕی بە پاک و بەرزو گەورەگرتنی لەدڵ دا پەیدادەبێ سەبارەت بە خواو سەرەنجام ؛ ئەوپەڕی خۆشویستن + ئەوپەڕی بەگەورەگرتن = خواپەرستی !!

دووەم : وە هەرکەسێک قۆناغی بیرو

باوەڕێکی ئیسلامی‌یانە هەڵبویـــرێ و (١)
بە ئەندازەی ئامادەیی( استعداد )ی خۆی
پێغەمبەران بەگشتی‌و پێغەمبەرمان بـــە
تایبەتی - علیهم من الله افضل الصلوات
واتم التسلیمات - بناسێ دەزانێ کـــە
گەورەترین و بەرزترین و بەرچاوتریـــن
خەسڵەتی ئەو زاتە بەرزانە بریتی‌بـــووە
لە بەندایەتی( عبودیة ) و خواپەرستـــی
( عبادة ) !! بۆ وێنە :
١-( ولقد سبقت كلمتنا لعبادنـــــــا
المرسلين ) الصافات / ١٧١ .
وەک دەبینین خوای پەروەردگار بەرلەوەی
پێغەمبەرانی بە شۆڕەتی پێغەمبەرایەتی
( نبوة ) وەسف بکات بە بەندایەتـــــی
( عبودية ) وەسفیان دەکات !
٢-( واذكر عبادنا ابراهيم واسحـــاق
ويعقوب اولي الايدي والابصار ) ص/٤٥ .
لێرەش دا دەبینین خوای قسەلەجێ نـاوی
سێ پێغەمبەری پایەبەرزی خۆی عليهم السلام

(١) هەڵبواردنی شتێک واتە تەواوکردنی‌و لێ تێپەڕین و بەجێ هێشتنی .

بەس بە شۆرەتی بەندایەتی باس دەکات!

٣-( ووهبنا لداود سليمان نعم العبد انه اواب ) ص/ ٣٠.

لێرەش دا کە مەدحی سولەیمان علیه السلام دەکات بە وشەی ( چاکترین بەندە ) مەدحی دەکات!

٤-( سبحان الذی اسری بعبده ليلا من المسجد الحرام الى المسجد الاقصی ..) الاسراء / ١.

لێرەش دا کە لە بەرزترین حاڵەت و گەورەترین پلەوپایەدا - کە حاڵەت و پلەوپایەی شەورۆیی و بەرزبوونەوەیە بۆ ئاسمانەکان - نازناوی بەندایەتی بۆ پێغەمبەری کۆتایی بەکارهێناوە، دیسان ئەوە دەگەیەنێ کە بەندایەتی و خواپەرستی گەورەترین و چاکترین خەسڵەتی ئینسانە.

هەربۆیەش خوای زانا و کاربەجێ خواپەرستی( عبادە ) ی کردۆتە تاقە ئامانجو مەبەستی دروستکرانی جندو

مرۆڤ ، ( وما خلقت الجن والانس الا ليعبدون ) الذاريات / ٥٦ . واته : وه جندو مرۆڤم بەس بۆ ئەوە خولقاندوون که بمپەرستن .

ئنجا بێگومان کەسێک خەت و ڕێبازی پێغەمبەران صلى الله عليهم وسلم بگرێ و خۆی له ڕیزی شوێنکەوتووانیاندا لەقەڵەم بدات ، دیارە ئەویش وەک ئەو ڕابەرو براگەورانەی خۆی دەکات و ، هەوڵ دەدات گەورەترین و بەرزترین خەسڵەتی بریتی بێ لە خواپەرستی و بەندایەتی .

سێ یەم : وە هەرکەسێک خاوەنی بیرو باوەڕێکی ئیسلامیيانە بێ کە لەدوای بڕوابەخوا بوون ، بڕوا بەدوا ڕۆژبوون گەورەترین پایەو بنچینەیەتی ، هەوڵ دەدات خۆی بۆو ڕۆژە ئامادە بکات و ، هەوڵی وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خواو ئەو بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەیە بدات که شەیتانی بەدو ئەفرین لێکراو

سوێندی خواردوه کارێک بکات چاوی پێی نەکەوێ و دەم لە نازو نیعمەتەکانی نەدات، دیارە بەو مرادەش ناگات هەتا ئەو خەسڵەتە بەرزە دەستگیر نەکات، کە دەیکاتە قەڵغان و خۆی پێ لە تیری ژەهراوی شەیتان قوتار دەکات، ئەو خەسڵەتە بەرزەش بە دەقی قورئان بەندایەتیو خواپەرستییە؛ (قال رب بما اغویتنی لازینن لهم فی الارض ولاغوینهم اجمعین. الا عبادک منهم المخلصین. قال هذا صراط علی مستقیم. ان عبادی لیس لک علیهم سلطان ...) الحجر / ٣٩،٤٠،٤١،٤٢.

بەڵێ: بەپێی بڕیاری نەگۆڕی خودا هەرکەسێک بەندە (عبد)ی ڕاستەقینەی خوا بێت، شەیتان حەددی نیە خۆی لە قەرە بدات!

هەروەها کەسێک بڕوای بە ڕۆژی دوایی هەبێو سوور سوور بزانێ کە ئەو سەفەرە سەختو دژوارەی لەپێشە دەبێ (تویێشوو) (زاد) ی بۆ هەڵگرێ،

چاکترین تویشووی ئەو ڕێ یەش بریتیە لە پارێزکاری ( تقوی ) ، وەک خودا فەرموویەتی :( .. وتزودوا فان خیر الزاد التقوی ..) البقرە / ١٩٧ .

ئنجا پارێزکاریش بەرهەمی خواپەرستیو بەندایەتیە ، وەک خودا فەرموویەتی :( یا ایها الناس اعبدوا ربکم الذی خلقکم والذین من قبلکم لعلکم تتقون ) البقرە / ٢١ . واتە : ئەی خەڵکینە ! ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن کە ئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەی دروست کردوە ، بەشکم پارێزکاری بکەن. ( واتە لە ڕێی خواپەرستیەوە خەسڵەتی پارێزکاری وەدەست دێنن ) .

چوارەم : وە هەرکەسێک خاوەنی بیروبڕوایەکی ئیسلامی بێ خڵتەو ڕاست بێ، دیارە برادەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خۆش دەوێن و ڕێزیان لێ دەگرێ ، خوا لێیان ڕازی بێ، وە بە خەت و شوێن پێی وان دا دەڕوات ،چونکە

خوای پەروەردگارو پێغەمبەری سەردار صلی الله علیه وسلم لە چەندان دەقی بێ پێچوپەنا ( نصوص صریحه ) مەدحیان کردوون و ڕەزامەندی خۆیانیان لەبارەوە دەربڕیون . دیارە هەرکەسێکیش خۆی بە بەندەی خواو شوێن کەوتووی پێغەمبەری پێشەوا بزانێ، دەبێ لانی کەم ئەوەندە ڕێزو حورمەتەیان لێ بگرێ کە هەرکەسێک ئەوان بەچاکیان زانیو لێی ڕازی بوون، ئەویش بەچاکی بزانێو لێی ڕازی بێ ، چونکە مسۆگەر مسۆگەر خوای زاناو وردبین چاکتر بەندەکانیو، پێغەمبەری لێزان و دووربینیش باشتر هاوەڵانی خۆی دەناسێ !

دەجا مسوڵمانی سەنگین !

زۆر چاک بزانە کە گەورەترین و درەوشاوەترین خەسڵەتی برادەرە پاریزکارو فیداکارەکانی پێغەمبەر خوا لێیان ڕازی بێ بریتی بووە لە خواپەرستی ( عبادة ) وەک خودا فەرموویەتی :

( محمد رسول الله والذين معه اشداء علی الکفار رحماء بینهم تراهم رکعا سجدا یبتغون فضلا من الله ورضوانا سیماهم فی وجوههم من اثر السجود .. ) الفتح / ۲۹ . واته :

موحەممەد پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم وە ئەوانەی کە لەگەڵنی لەسەر کافران توندوتیژن لەگەڵ یەکتردا بەبەزەیین ، - بەزۆری - بە رکووع و کڕنووش بردوویی دەیانبینی، بەخشش و ڕەزامەندی لەخوا داوادەکەن ، نیشانەی خۆیان لە ڕوویان دایە ، لە ئەنجامی کڕنووش بردن دا ..

پێنجەم : وە لە کۆتایی دا :

هەرکەسێک خاوەنی بیروبڕوایەکی ئیسلامی بێ دیارە ئەوپەڕی ڕێزو حورمەت و وەفاو ئەدەبی دەبێ بەرانبەر بەو زاناو خواناسە ڕەسەنانەی کە بەڕاستی میراتگرو جێگری پێغەمبەر بوو ون خوا لێیان خۆش بێ‌و پاداشتی بەرزیان بداتەوە ، وە هەوڵ دەدات لە

دەریای پڕگەوهەرو مرواری زانست و ئەدەب و ڕەوشت و ئاكاریان بەهرەمەند بێت و، شوێن پێیان هەڵبگرێ ، دەجا دیارە كە ئەمانیش وەك پێغەمبەری پایەبەرزمان و هاوەڵە وەفادارەكانی زەق ترین و سەرەكی ترین خەسڵەتیان بریتی بووە لە خواپەرستیو لەخوا نیزیك بوونەوەو بەرەوخوا چوونی بەردەوام و بێ پشوو .

ئەمەش چەند نموونەیەكی كورت لە جۆرو چۆنیەتی خواپەرستی هەركام لەو پێنج پێشەوایانەی كە ئەمڕۆ لەنێو ئۆممەتی پێغەمبەرمان دا صلی اللە علیە وسلم شوێن كەوتوو ( مقلد ) یان هەن :

١- ( ابوحنیفە ) :

گوتراوە كە ئەبوو حەنیفە خوا لێی خۆش بێ ماوەی چل ساڵی نوێژی بەیانی بە دەست نوێژی خەوتنان كردوە ، وە دراوسێ یەكانی گێڕاویانەتەوە كە

بە شەوێ گوێ یان لە دەنگی نوێژکردن و قورئان خوێندن و گریانی بووە لە ترسی خودا .

وە دەڵێن لە سەردەمی وی دا مەڕی کووفە لەگەڵ ئی دەوارنشینانی بیابان تێکەڵ بوو ، پرسیاری کرد داخوا مەڕ چەند ساڵان دەژی گوتیان حەوت ساڵان ئەویش ماوەی حەوت ساڵان گۆشتی مەڕێ ی نەخوارد !!

وە دەڵێن لە سێبەری درەختی کەسێک دا دانەدەنیشت کە قەرزی ئەبو حەنیفەی لەسەربا ، وە دەیفەرموو ( کُلّ قرض جَرَّ نفعاً فهو ربا ) !!

واتە : ئەو دانیشتنەی بە سوود ( ربا ) لەقەڵەم داوە !

وە دەڵێن لەو شوێنەدا کە وەفاتی تێدا کرد لە حەپسخانەدا حەوت هەزار جار قورئانی خەتم کرد .

وە ئەبو حەنیفە بە دنیا بەکەمگرتن و قەناعەت و کەم دوێیی و سینەفراوانی و لێبوردەیی و سەخاوەت ناوبانگی دەرکردووە .

٢- ( شافیعی ) :

ئیمامی شافیعی خوا لێی خۆش بێ زۆر لەخواترس بووەو نیوەی شەوێ شەونوێژی کردووە ! وە جارێکی گوێی لە قورئان خوێنێک بوو ئەم دوو ئایەتەی دەخوێندن :( هذا یوم لاینطقون ولایُؤذَن لهم فیعتذرون ) المرسلات /٣٥ ، ٣٦ . یەکسەر بێ هۆش بوو !!

وە بە (٧) ساڵی هەموو قورئانی لەبەرکردووەو لە تەمەنی (١٠) ساڵیدا ( موطأ ) ی مالیکی لەبەرکردوە .

وە ئیمامی شافیعی پەندو قسەی نەستەق و رەونەق داری (١) زۆرن ، بۆ نموونە :

١- هەرکەسێک ئارەزووەکانی دنیا بەسەری دا زاڵ بن ، دەبێتە کۆیلەی دنیاداران .

٢- وەدەست هێنانی زانیاری لە نوێژی سوننەت چاکترە .

٣- ڕووخۆشی لەگەڵ تێکڕای خەڵکی

---

(١) بڕوانە ( الائمة الاربعة ) د . احمد شرباصی

دۆستی بەدیش بۆ مرۆڤ پەیدا دەکات،
ڕووگرژیش کینەو بوغز پەیدا دەکات،
کەواتە دەبێ لەنیوان ڕووخۆشی و
ڕووگرژی دا ڕێ یەکی هەڵبژێری .

٤- هەرکاتێک دۆستت گوێ ڕایەڵی دوژمنت
بوو، ئەوە لەگەڵ دوژمنت یەکسانن .

٥- وە دەربارەی نەفس بەرزی خۆی
فەرموویەتی :

عليَّ ثيابٌ لو تُباعُ جميعها
بِفَلسٍ لكانَ الفَلسُ أكثَرا
وفيهن نفسٌ لو تُقاس ببعضها
نفوسُ الوَرىٰ كان اجلَّ وأكبَرا

٣- ( احمد ) :

ئیمامی ئەحمەد خوا لێی خۆش بێ زۆر دنیا بە کەمگرو خواپەرست بووە، زوربەی پێخۆری سرکە ( خل ) بووەو ئەگەر ئارەزووی خواردنی دیکەی کردبێ نیسکیان بە پیوێ بۆ لێ دەنا !

شەوی هەموو تەرخان کردبوو بۆ خواپەرستیو، کەم تێکەلێ خەلکی دەبوو، مەگەر لە مزگەوت یان مردوونا شتن یان سەردانی نەخۆش دەنا لە مالێ نەدەچۆ دەرێ !

لە سەردەمی مەئموون و موعتەصیمدا لەبەر ئەوەی بەپێی ڕای وان فتوای نەدا کە قورئان دروست کراو ( مخلوق ) ە، (١٨) مانگان گیراو هێندەی بە قەمچیان لێدرا هەتا خوێنی لەبەر ڕۆیی و لەهۆش خۆی چوو !!

٤ـ مالیک :

ئیمامی مالیک خوا لێی خۆش بێ زۆر پارێزکارو خواپەرست و دووربین بووە، جارێکی کابرایەک هاتەلای و پرسیارێکی لێ کرد ئەویش مۆڵەتی لێ خواست هەتا بیری لێ بکاتەوە، کابرا گوتی :

خۆ ئەمە مەسەلەیەکی سووکە ! مالیک توڕە بوو و فەرمووی :

مەسەلەیەکی ئاسان و سووکە !

... مەگەر قسەی خوات نەبیستوە ( انا سنلقی علیک قولا ثقیلا ) ؟!

زانیاری ( علم ) هەمووی قورسە، بەتایبەتی ئەوەی کە ڕۆژی دوایی لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ !!

جارێکی دی کابرایەک هاتەلای و (٤٨) پرسیاری شەرعی لێ کرد ، لە وەلاّمی (٣٢) یان دا فەرمووی :

نازانم ( لا أدری ) !

وە ئیمامی مالیک هێندە ڕێزی پێغەمبەری دەگرت کە شەرمی دەکرد لە

شاری مەدینەدا سواری وڵاخی بیێت، وە دەیفەرموو ئەمن شەرمێ دەکەم سواری وڵاخێک بم کە سمەکانی بکەونە سەر زەوی یەک کە جەستەی پێغەمبەری خوای تێدا شێرراوەتەوە !! (١)

---

(١) بۆ ئەوەی لێرەدا دەربارەی چوار پێشەوایەکانم نووسیوە سوودم لە ( الاجتهاد والمجتهدون ) ی احمد عزالدین البیانونیو ( یسالونک فی الدین والحیاه ) ی احمد شرباصی بەرگی (٦) وەرگرتوە .

٥- ( جعفر الصادق ) :

ئیمام جەعفەری صادیق خوا لیّـی خۆش بێ کە سەرمەزەب و پێشەوای شیعەی دوازدە ئیمامی( الشیعە الاثناعشریە )یە جێگرو میراتگرێکی ڕاستەقینەو ڕەسەنی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم بووەو، شەهرەستانی خاوەنی کتێبی( الملل والنحل ) لە وەسفیدا گوتوویەتی :

( هو ذو علم غزیر، وادب کامل فی الحکمە، وزهد فی الدنیا، و ورع عن الشهوات )[1] ، وە ئیمام جەعفەری صادیق ویّڕای خواپەرستیو پارێزکاری و دنیا بەکەمگرتن و ئەدەب و ڕەوشتی بەرزو پەسند، بە زانیاری و شارەزایی - یەکی فراوان و هەمەلایەنە شۆرەتی دەرکردوەو خەلّکێکی زۆری لەسەر دەستی تێ گەیشتوەو پێ گەیشتوە، وە پەندو ئامۆژگاری و قسەی نەستەقی زۆری لێ دەگێڕنەوە، کە ئەمانە چەند

---

(١) بڕوانە ( مجموعة گفتارها ) شهید مطهری ، ص ٢٣٧ .

گەوهەرێکن لە دەریای دەوڵەمەنـــــدی زانست و عیرفان و حیکمەتی :

١- دەربارەی برادەرایەتی دەڵێ :

( برادەرایەتی چەند مەرجی هەن ، جا هەرکەسێک ئەو مەرجانەی تێدا نەبن بە برادەری تەواوی مەزانە :یەکــەم : دەبێ پەنهان و ئاشکرای وەک یەک بن ، دووەم : کە جوانی تۆ بە جوانی خۆی و ، عەیبت بە عەیبی خۆی بزانێ ، سێیەم : کە سامان و منداڵ نەیگۆڕن ، چوارەم : کە هەرچی لەدەستی بێ بۆت بکــات ، پێنجەم : کە لە تەنگانان دا پشتــت بەرنەدات ) .

٢- دەربارەی خۆبەزلگری ( تکبر ) دەڵێ :

( هەرکەسێک خۆی بەزل بگرێ و دەمار بنوێنێ ، ئەوە حەتمەن لەبەر ئەوەیــە لە نەفسی خۆی دا هەست بە زەبوونی یەک دەکات ) ( واتە بەو خۆبەزلگرتــن و فیزو دەمارە دەیەوێ ئەو ناتـــەواوی و نزمی‌یە قەرەبوو بکاتەوە کە لەخۆی دا

هەستی پێدەکات ، هەروەک چۆن بەعـــزە دەعبایەک لەئاتی مەترسیدا خـــــۆی فش دەکاتەوە هەتا قەبارەی خـــــۆی گەورەبکات و بەرانبەرەکەی وا تێبگەیەنێ کە لەو شێوە ڕواڵەتییەی بەرزترە کـــە ئەو دەیبینێ ) .

٣- وە دەربارەی پێناسەی مرۆڤی نەفام گوتوویەتی :

( لە عادەتەکانی بابای نەفام ئەوەیە ، کە پێش بیستن وەڵام دەداتەوە ، وە بـــێ ئەوەی حاڵی بووبێ نارەزایی دەردەبـــڕێ وە بە نەزانی حوکم دەدات )(١) .



---

(١) ئەو پەندو قسە نەستەقانەم لـــە کتێبی ( الصداقە والاصدقـــاء ) ی هادی المدرسی وەرگرتن .

## دوو ئاگاداری

یەکەم : وشەی خواپەرستی ( عبادة ) وەک لە کتێبی ( مسوڵمانی کامڵ ) دا بە درێژی باسمان کردوە لە ڕوانگـــەی ئیسلامەوە بە دوو مانایان بەکارهاتوە، مانایەکیان یەکجار فراوان و مەزنـــەو هەموو یاساو دەستوورەکانی ئیـــسلامو، سەرتاپای ژیان و، دەرو دەروونی ئینسان دەگرێتەوە، وە ماناکەی دیکەشیـــان تایبەتی‌و سنووردارە، بەس نوێژو ڕۆژوو وە زیکرو پاڕانەوەو حەجو قورئـــان خوێندن و ئەو جۆرە شتانە دەگرێتـــەوە. جا ئێمە لەم بەندەدا مانای دووەمـــان تێدا ڕەچاوکردوە، هەڵبەتە کــــە دەشگوترێ ( خواپەرستی) زۆربـــەی هەرەزۆری حەڵکی بە حوکمی عورف و باوی نێو کۆمەڵ هەر مانای دووەمیان بـــۆ. وشەی ناوبراو بەزەین دا دێ ،هەرچەندە قورئانیش بەزۆری وشەی ناوبراوی هـــەر

بە مانای یەکەمیان بەکارهێناوە .

جا ئێستا کە زانرا ئێمە لێرەدا مەبەستمان لە وشەی (خواپەرستی) چییە! با بچینە سەر ئاگاداری دووەم .

دووەم : رەنگە یەکێک بپرسێ ؛ باشە مەبەستت لە ( خواپەرستی یەکی ساڵحانە )چییە ؟!

لەوەلامدا دەڵێین :

خوای پەروەردگار فەرموویەتی :

( الذی خلق الموت والحیاه لیبلوکم ایکم احسن عملا ..) الملک / ٢ .

واتە : ئەو زاتەی کە مردن و ژیانی هێناوەدی هەتا تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی چاکترە .. !

توێژەرەوان ( مفسرون ) ی قورئان لێکدانەوەی جۆراوجۆریان بۆ وشەی ( احسن عملا ) هێناونەوە ، بەلام لە هەموویان چاکتر لێکدانەوەی ( فضیل بن عیاض ) ە ، کە فەرموویەتی :

( احسن عملا ای اخلصه واصوبه )،

پرسیاریان لێکرد کە مەبەستت لە (اخلصە) و (اصوبە) چییە؟ فەرمووی: کردەوە ئەگەر بێت و بێ خلتە (خالص)یش بێ مادام ڕاست (صواب) نەبێ وەرناگیرێ، وە ئەگەر ڕاست (صواب)یش بێ مادام بێ خلتە نەبێ دیسان وەرناگیرێ، کەواتە:

مەرجی وەرگیرانی کردەوە ئەوەیە کە هەم بێخلتە بێ هەم ڕاست بێ، بێخلتە بێ یانی بەس بۆ خوا بێ، وە ڕاست بێ یانی بەپێی سوننەت بێ. (١)

بەڵێ منیش مەبەستم لە خواپەرستی ساڵحانە ئەوەیە کە، یەکەم: پاک و بێ خلتە بێ و بەشی غەیری خوای ڕەگەڵ نەکەوێ، دووەم: چاک و بێ هەڵە بێ و، بەگوێرەی ڕێ و شوێنی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم بێ و بیدعەتی تێکەڵ

(١) بڕوانە (العبادة فی الاسلام) ص١٦٦ د. یوسف القرضاوی.

نەبێ، جا ئێمە توێژینەوەی مەسەلـــەی بیدعەت هەڵدەگرین بۆ دوایە، بــــەڵام با کۆتایی ئەم قوڵە باسە گرنگە بـــەم ئایەتە بەپێزە بێنین کە دەفەرموێ:

( بلى من اسلم وجهه لله وهو محســـن فله اجره عند ربه ...) البقرة / ١١٢ .

واتە : با ـ مسوڵمانان دەچنە بەهەشتێ ـ هەرکەسێک بۆ خوا مل کەچ بێ‌و لـــــە هەمان کاتیش دا چاکەکار بێ ئـــــەوە پاداشتی خۆی لای پەروەردگاری هەیە ..

وەک دەبینین لێرەش ( اسلم وجهه ) کە مانای بۆخوا یەکلابوونەوە ( اخلاص ) دەگەیەنێ، بەتەنی نەکراوەتە مایـــەی پاداشتدرانەوە هەتا ( وهو محســـن ) کە مانای بەپێی سوننەت بەڕێوەچـوون دەگەیەنێ، نەکراوەتە پارسەنـــــگ و لاتای ..

جا خوا بمانگێڕێ لەو کەسانەی کـــە بەس خودا دەپەرستن و هاوبەشی بـــــۆ پەیدا ناکەن و، تەنیا بەو شێوەیـــەش

دەپەرستن کە بۆخوی لەسەر زمانـــــی پێغەمبەرەکەی بۆی بڕیاردا ون و بە موو لبێ لانادەن ! بەشکم لەسۆنگەی ئـــەو خواپەرستییە ڕاست و بێ خلتەیــــەوە بچینە ریزی ئەو بەندە ساڵحانەی کـــە خودا بەڵێنی بە میراتگرتنــــی زەوی پێ داون ، وەک فەرموویەتی :

( ولقد كتبنا في الزبور من بعد الذكر ان الارض يرثها عبادي الصالحـــون ) الانبياء / ١٠٥ .

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە بچینـــە سەروکاری بەندی چوارەم ( ڕەوشتێکی خوایی یانە ) .

بەندی چوارەم

## خوو و ڕەوشتێکی خوایی یانە

١

خوێنەری خۆشەویست !

وەک لەپێشەوە گوتمان و لە بەشی سێیەمی ( مسوڵمانی کامڵ ) یش دا بە تێروتەسەلی ڕوونمان کردۆتەوە، خوو و ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند میوەو بەرهەمی سروشتی‌و چاوەڕوان کراوی درەختی خواپەرستی‌و لەخوا نیزیک بوونەوەیە، دەزانی بۆ ؟!

چونکە وەک گوتراوە :( المجاورە مؤثرە ) وە وەک لە دنیای واقیعیش دا دەبینین هەروایە، ئەوەتا خڕۆکەی زەوی ( الكرة الارضيە ) هەرچەندە بۆخۆی تاریک وتەڵەو هیچ تروسکایی یەک شک نابات، بەلاّم لەسۆنگەی ئەوەوە کە هاوڕێ یەتی ڕۆژێ دەکات و لێی نیزیکە، دەبینین ڕووناک داهاتووەو بۆتە چراخان، هەروەها مانگیش بە هەمان شێوە !

بەلاّم جێی سەرنج ئەوەیە کە مانــــگ هەرچەندە زۆریش لە زەوی گچکەترە، بەلاّم پتر لە تیشک و ڕووناکی ڕۆژێ بەهرەمەند بووە، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە مانـــــگ ئامادەیی ( استعداد ) شوعلەوەربـــوون و عەکس کردنەوەی زیاترە !

ئنجا وەک لەپێشەوەش گوتمـــــــان خواپەرستی دوو ڕەگی هەن کە پێیانــەوە بەندەو شتاقیشیان (١) بێ ئەوی دیکـــە سوودی نابێ، یەکەم: بەس خوا مەبەسـت بوون ( اخلاص ) دووەم: بەپێی سوننـــەت بەڕێوەچوون ( الاتباع ) !

کەواتە: خواپەرستی یانی لەخـــوا نیزیک بوون و لە پێغەمبەر صلی اللـــه علیه وسلم نیزیک بوون، دەجا ئاشکرا شە کە مرۆڤ هەم بەهۆی لەخوا نیزیک بوونی‌و هەم بەهۆی لە پێغەمبەر نیزیک بوونیەوە

---

(١) شتاق : یانی هیچ کامیان، ئەوەندە هەیە وشەی ناوبراو بەس بـــۆ دوو شتان بەکاردێ .

بە ئەندازەی نیزیکیەکەی ڕەوشت و
خووی بەرزو پەسند دەبیؑو سیفەتە
چاکەکانی تیؑدا دیؑنەدی ، چونکە :
١- خوای بەرزو مەزن خاوەنی هەموو
سیفەتیؑکی بەرزو پەسندو چاکەو
لە هەموو جۆرە کەموکووری و لەکەیەکیش
دوورە ، مادام وابیؑ هەروەک چۆن مانگی
لە ئەسلؑدا بیؑ شۆق و تاریک ، لە
ئەنجامی نیزیکی لە ڕۆژیؑ وە ، نەک
هەر ڕووناک داماتوە ، بەلؑکو ڕووناکییش
بلاؑودەکاتەوە ، ئینسانیش بەهەمان شیؑوە ،
بە ئەندازەی لەخوا نیزیک کەوتنەوەی
دلؑ و دەروونی بە تیشکی سیفەتە بەرزو
پەسندەکانی ڕۆشن دەبیؑتەوەو بەرەو
بەرزی و پەسندی دەچیؑ ، هەربۆیەش
وشەی ( ربانی ) کراوەتە نازناوی
ئەو خواناسە ڕاستەقینانەی کە لەخوا
نیزیکن ، وەک خودا فەرموویەتی :
( ..ولکن کونوا ربانیین بما کنتم
تعلمون الکتاب وبما کنتم تدرسون )
آل عمران / ٧٥ .

بەڵێ هەروەک چۆن کەسێک کە زۆر سەرگەرمی دنیایەو لەگەڵی تێکەڵەو لێی نیزیکە پێی دەگوترێ ( دنیایی ) ، وە کەسێک کە خوو و خدەی ئافرەتانە ڕەچاوبکات و وەک وان ڕەفتار بکات پێی دەڵێن ( ژنانی ) ، کەسێکیش کە بەزۆری لەگەڵ خوادایەو سەرگەرمی یادی ویە پێی دەگوترێ ( خودایی ) ، چونکە بە ئەندازەی نیزیکی لە خواوە لە تیشکی سیفەتە چاک و پەسندەکانی بەهرەمەند دەبێ، وەک : بەزەیی و بەخشش و لێبوردن و زانیاری و پاکی و چاکیو .. (۱) هتد .

۲- دیسان بەهۆی نیزیکیش لە پێغەمبەرەوە علیه الصلاة والسلام ئینسان لە خوو و خدەو ئاکارو ڕەفتاری بەرزو پەسندی خوایی یانەی دەبێتە خاوەن پشک و بەش ، دیارە بەگوێرەی نیزیکیو بە ئەندازەی ئامادەیی خۆی .

---

(۱) دیارە مەبەست بەس ئەو سیفەتانەن کە لە بەندە دەوەشێنەوە ، وەک ئەوانەی گوتراون، نەک هەموو سیفەتێکی خوا .

ئنجا لەڕاستیدا نیزیکیش لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هەر بریتیە لە نیزیکی لە خوای پەروەردگار، چونکە وەک خانوون عائیشەی دایکی بڕواداران خوا لێی ڕازی بێ لە وەڵامی کەسێک دا کە لێی پرسی : خوو و ڕەوشتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چۆن بوو؟! فەرمووی : ( كان خلقه القرآن ) رواه مسلم وابوداوود . واتە : خوو و ڕەوشتی وی بریتی بوو لە قورئان !

هەربۆیەش خوای زانا و میهرەبان پێی ڕاگەیاندووین کە ڕێی بەرەو خوا چوون و لەلای خوا خۆشەویست بوون بەس شوێن کەوتن ( اتباع ) ی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم :( قل ان كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله .. ) آل عمران / ٣١ . واتە : بڵێ : ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ ، وەدوای من بکەون خوا خۆشی دەوێن ..

جا مسوڵمانی شیرین و بەڕێز ! با سەرنج بدەین !

ئایا ئەگەر هاوڕێیەتی کردن و دۆستایەتی ئینسانێکی ئاسایی ساڵح و چاک گەورەترین دەوری چاکی هەبێ لە چاککردنی ئینسان ، جوان کردنی خوو و ڕەوشتیدا ، ئایا دۆستایەتی گرتن لەگەڵ خوا و پێغەمبەری بەڕێزدا صلى الله عليه وسلم چ دەورێکی دەبێ !!

هەڵبەتە ئەلیرەشدا حیکمەتی زۆر سەڵەوات ناردن بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەردەکەوێ ، ئەویش ئەوەیە کە بەهۆی زۆر یادی خوا کردن و زۆر سەڵەوات ناردن بۆ پێغەمبەرەوە زۆریان لەخزمەتدا دەبین و لێیان نیزیک دەبین دیارە ئەندازەی بەهرەوەرگرتنیشمان لێیان بارتەقای ئەندازەی نیزیکیمان و ئەندازەی لەخزمەتدا بوونیانمانە .

ئێستاش حەزدەکەم بەکورتی سێ مەسەلەی زۆر گرنگ سەبارەت بە خوو و

ڕەوشت بخەمەڕوو، بەرلەوەی ئەم بەندە بەجێ بهێڵین و بچینە سەر بەندی پێنجەم:

یەکەم: گرنگیی خوو[1] و ڕەوشتی پەسند لە چ دایە؟!

دەتوانین لە چەند خاڵێکدا گرنگیی خوو و ڕەوشتی بەرزو پەسند بخەینەڕوو:

١- خوو و ڕەوشتی پەسند ئامانجی نێررانی

---

(١) بەپێویستی دەزانم بۆ چاکتر ئاشکرابوونی (گرنگیی خوو و ڕەوشتی پەسند) پێناسەیەکی کورتی خوو و ڕەوشت (الاخلاق) بکەم:
ئەوەی کە لە قسەو لێکدانەوەی هەرکام لە (راغب الاصفهانی)[1] و (ابن منظور)[2] و (الرازی) (٣)، سەبارەت بە ماناو چەمکی وشەی (اخلاق) وەردەگیرێ ئەمەیە:
وشەی (خلق) بە بۆر یان زەنەی لامەکەی کۆ (جمع) یەکەی (اخلاق)ە و، راست وەک وشەی (خَلق) بە سدری خێ یەکەی وایە، ئەوەندە هەیە (خلق) تایبەتە بە شێوەو بیچم و دیمەنی ڕواڵەتی یەوە، بەلاّم (خُلق) تایبەتە بەو خوو و

خەسڵەتانەوە کە سروشت و گیانی ئینسان پێک دێنن . کەواتە وشەی ( خَلْق ) ئاوێنەی جەستەی مرۆڤەو ( خلق ) یش ئاوێنەی گیانیەتی .

---

(١) بڕوانە ( مفردات الفاظ القرآن ) ص ١٥٨ .

(٢) بڕوانە ( لسان العرب ) ج١٠ ص ٨٦ .

(٣) بڕوانە ( مختار الصحاح ) ص ٢٧٢ .

پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم
پێغەمبەری پێشەوامان لەوبارەوە
فەرموویەتی: ( انما بعثت لاتمم مكارم
الاخلاق ) رواه الامام مالك فى الموطا ،
واحمد والخرائطي عن ابى هريره بلفظ
( صالح ) بدل ( مكارم ) . واتە :
بێگومان من بەس بۆ تەواوكردنی
ڕەوشتە پەسندەكان ڕەوانەكراوم .
بێگومان هەر لەبەر ئەوەشە كە خوای
بەرزو مەزن كاتێك ویستوویەتی مەدحی
پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم بكات
بە ڕەوشتی مەزن و بەرزی مەدحی كردوە ،
( وانك لعلى خُلُق عظيم ) القلم / ٤ .
٢- پێغەمبەری مەزن چاكە ( البر ) ی لە
خوو و ڕەوشتی بەرزو چاكدا كورت
هەڵێناوە ، وەك دەفەرموێ :( البر حسن
الخلق .. ) رواه مسلم ، وە خوای زاناش
لە پێناسەكردنی چاكە (بر ) دا ئایەتێكی
ناردوتە خوارێ كە (١٩) خەسڵەتی تێدان ،
ئەو نۆزدە خەسڵەتەش وەك چوارچێوەیەكی

فراوان هەموو وردو درشتی ئیسلام دەنیو خۆیان وەردەگرن، ئەمەش ئایەتەکەیە :
( لیس البر ان تولوا وجوهکم قبل المشرق والمغرب ولکن البر من آمن بالله والیوم الاخر والملائکه والنبیین وآتی المال علی حبه ذوی القربی والیتامی والمساکین وابن السبیل والسائلین وفی الرقاب واقام الصلاة وآتی الزکاة والموفون بعهدهم اذا عاهدوا والصابرین فی الباساء والضراء وحین الباس اولئک الذین صدقوا واولئک هم المتقون ) البقره / ١٢٧ . کەواتە :
خوو و ڕەوشتی پەسند= چاکە= ئیسلام !
٣- ڕەوشتی چاک بەڵگەو نیشانەی تەواوی ی بڕوایە ، وەک پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :
( اکمل المومنین ایمانا احسنهم اخلاقا .. ) رواه الترمذی وقال حسن صحیح .
٤- ڕەوشت و خووی جوان قورس ترین شتە

له تەرازووی خوادا ، وەک پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :
( ما من شیء اثقل فی میزان المؤمن یوم القیامه من حسن الخلق ..) .
رواه الترمذی وقال حسن صحیح .
جا دیارە شتێک ئامانجو مەبەستی نێردراوی پێغەمبەرمان بێو ، یەکسان بێ بە ئیسلامو ، بەڵگەو نیشانەی بڕوا بێو ، گرانترین شت بێ لە تەرازووی خـوادا لە ڕۆژی دواییدا ، یەکجار گرنـگ و بایەخ دارە !

دووەم : بوارەکانی خوو و ڕەوشتی پەسند چین ؟!

لەوەڵامدا دەڵێین :
بوارو مەیدانەکانی خوو و ڕەوشتی بەرزو چاک چوارن :
١- بواری پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خوادا کە بەکورتی دەتوانین بڵێین :

ئەدەب و ڕەوشتی بەرز لەگەڵ خـــوادا ئەوەیە کە ئینسان هەوڵ بدات قـــەت خودا جل جلالە لە حاڵێکی حـــەرام و ناپەسند ( مکروە ) ی ڕواڵەتی و بەنهانیدا نەیبینێ !!

٢- بواری پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خۆی دا ،

ئەدەب و ڕەوشتی چاکی مرۆڤیش لـــە جوغزی خۆی دا بە دوو شتان دەکرێ ؛

یەکەم : هەوڵ بدات خۆی لە خوو و سیفەتە بەدو خراپەکان پاک بکاتـــەوەو ، سیفەتە بەرزو چاکەکان لەخـــۆی دا بێنێتەدی کە ئێمە لە بەشی سێ یەمـــی ( مسوڵمانی کامڵ ) دا (٦٣) خەسڵەتمان لێ خستوونەڕوو .

دووەم : هەوڵ بدات هەر لە تەپڵـــی سەری یەوە هەتا بەری پێ یانـــی واتە تێکڕای ئەندامە ڕواڵەتـــی و پەنهانی یەکانی مل کەچی فەرمانی شەرع بن و ، لە خراپەو هەڵە دووربن ، کە لە سەرچاوەی ناوبراودا لە (٢٧) خاڵـــی

سەرەکیدا ڕوونمان کردۆتەوە .

٣- بواری پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خەڵک دا

دیارە خەڵکیش زۆرو جۆراو جۆرەو هەر جۆرەشیان ئەدەب و ڕەوشتێکی تایبەتی پێویستە، کە دەتوانین جۆرەکانی خەڵک لەم حاڵانەدا بخەینەروو :

یەک : پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بەگشتیو پێغەمبەرمان صلی اللـه علیه وسلم بەتایبەتی .

دوو: برادەرە بەڕێزەکانی رضی اللـه عنهم وارضاهم .

سێ: زاناو چاوساغو میراتگرانی ڕەسەنی پێغەمبەر صلی اللـه علیه وسلم .

چوار: براگەورەو فەرماندەکانمان ، یان براگەورەو فەرماندەکان لەگەڵ ژێردەستانیان دا .

پێنج: دایک و باب

شەش : هاوسەر ( ژن - مێرد )

حەوت : منداڵ ( کوڕو کچ )

هەشت : خزم ( خزمی پشتێو ئی بەرێ ) .
نۆ : دراوسێ ( دوور بێ یان نیزیک هەتا
چل ماڵ لەهەر چوار لاوە ، وەک ....
" طحاوی " گێڕاویەتەوە ) .
دە : برادەر
یازدە : میوان ( بیناسی یان نا )
دوازدە : ڕێبوار ( ابن السبیل )
سێزدە : تێکڕای خەڵکی مسوڵمان
چواردە : ناحەزو دوژمنانمان

جا سوپاس بۆخوا لە بەشی سێ یەمی ( مسوڵمانی کامڵ ) دا ، جۆرو چۆنیەتی ئەدەب و ڕەوشتی بەرزی ئیسلامی بۆ چۆنیەتی هەڵس وکەوت کردن لەگەڵ هەموو ئەم جۆرە خەڵکانەدا بە تێروتەسەلی توێژراوەتەوە ، وە لە بەشی دووەمی ئەم نامیلکەیەش دا جۆرو چۆنیەتی هەڵویستی مسوڵمان سەبارەت بە قورئان و سوننەت و پێغەمبەرو برادەرە بەڕێزەکانیو زانایان دەخەینەڕوو .

٤- بواری پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ دەوروبەری دا .

مەبەستم لە دەوروبەر هەموو ئەو شتانەن کە مرۆڤ لە ژیانیدا هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دەکات ، هەر لە ئاسمانو مانگ و ڕۆژو ئەستێرەو شاخوداخو باغ و ڕووبارو ئاگرو ئاسنەوە بیگرە هەتا ماڵات و کەل وپەل و پەڕەورو مێروو ..

دیارە بۆ هەڵس وکەوت( معاملە ) کردنیش لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ، چەند یاساو دەستوورو ئەدەب و ڕەوشتێکی تایبەتی دیاری کردوون کە پێویستە بابای مسوڵمان ڕەچاویان بکات ، بۆ وێنە : مسوڵمان دەبێ بیر لە هەموو شتێک بکاتەوەو هەوڵ بدات پەندی لێ وەربگری ، وە دەبێ هەوڵ بدات چاکە لەگەڵ هەموو شتێک دا بکات و خزمەتی بکات ، وە نابێ بەبێ هۆ هیچ گیاندارێکی بێ زەرر ئازار بدات ،وە

نابێ هیچ زیندوویێک بە ئاگر ئـــازار بدات و بسووتێنێ، وە نابێ لەعنەت لە مالآت بکات یان جنێوی پێ بلێ.. هتد .

سێ یەم : ڕێگەی وەدەست هێنانی ڕەوشتی بەرز چی یە ؟!

لە وەلامدا دەلێین :

لەخوا بەزیادبێ ئێمە ئالقەی دووەمی ئەم زنجیرەیەمان تەرخان کردوە بــــۆ توێژینەوەی ئەم مەسەلەیە، بەنــاوی : ( چاکترین ڕێی بەرەوخوا چـــوون ) ، دیسان لە کۆتایی بەشی سێ یەمـــــی ( مسولمانی کامل ) یش دا شتێکمــان لەوبارەوە خستۆتەڕوو، بۆیە بەپێویستی نازانم لێرەدا لەسەری بڕۆم، بـــەلام هەر بەکورتی دەلێم :

هەر ئینسانێک ئاگای لە دل ( قلب )و زمان ( لسان ) ی خۆی بێ و، بەچاکـــی چاودێری یان بکات و بیان پارێـــزێ ،

حەتمەن ڕێگەی ڕەوشت بەرزبوون و چاک بوونی لەبەردەمدا ئاچووغو هەموارە، هەڵبەتە هەم لە قورئانی خواو هەم لە سوننەتی پێغەمبەری پایەبەرزدا صلی الله علیه وسلم دەقی زۆرو زەوەندە هەن دەربارەی گرنگیو پێویستی پاراستن و چاودێری کردنی دڵ و زمان، بەلاّم ئێمە لەبەر کەمی دەرفەت بەس دووانیان لێ بە نموونە دێنینەوە :

١- ( ألا ان فی الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد کله واذا فسدت فسد الجسد کله الا وهی القلب )متفق علیه .

٢- ( من یضمن لی ما بین لحیه وما بین رجلیه اضمن له الجنه ) متفق علیه.

ئنجا چۆنیەتی پاراستنی ( دڵ ) یش بەوە دەبێ، کە ئینسان بەزۆری بە یادی خواوە سەرگەرم بێ هەتا نەیپەرژێتەسەر شتی دیکە . وە چاودێری بکات کە ڕیابازی و خۆبەزلگری و

خۆپەسندی و بەدگومانیو حەسەدو دەغەڵیو .. هتدی تێدا جێگیرنەبێت و، بەردەوامیش بگەڕێتەوە بۆ لای خواو بە ئاوی سافی تۆبەو داوای لێبووردن کردن بەردەوام دڵی بشوات و نەیەڵێ ژەنگ وژارو چڵک وچەپەری خوتخوتەی خراپ و سیفەتە پیسەکان کەمڕەی لەسەر ببەستێ، پێغەمبەریش صلی اللە علیە وسلم دەربارەی لابردنی ژەنگی سەر دڵان و پاک ڕاگرتنیان فەرموویەتی :

( ان هذه القلوب تصدا کما یصدا الحدید اذا اصابه الماء ، قالوا : وما جلاؤها ؟ قال : کثرة ذکر الموت وتلاوة القرآن ) رواه البیهقی .

وە پاراستنی زمانیش بەوە دەبێ ، کە ئینسان لە یادی خواو قسەی هەق و چاکەدا نەبێ بەکاری نەیەنێو ، مەگەر قسەیەکی پێویست هەبێ دەنا زمانی خۆی گرێ بدات و لێو لەسەر لێوی هەڵنەگرێ، چونکە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم

فەرموویەتی: ( اكثر خطايا ابن آدم من لسانه ) رواه الطبراني والبيهقي .

وە دەربارەی پاراستنی زمـــــان فەرموویەتی: ( من كان يومن بالله واليوم الاخر فليقل خيرا او ليسكت ) متفق عليه .

کەواتە :

با هەوڵ بدەین هەرچی زیاتر دڵمان ساغو سەلیمو ساف بێ، چونکە دڵی ساغ و سەلیم دەستمایەی دەستی مرۆڤە لـــە دوارۆژدا : ( يوم لاينفع مال ولا بنون . الا من اتى الله بقلب سليـــــم ) الشعراء / ٨٨ ، ٨٩ .

دەبا هەوڵ بدەین زۆر ئاگـــاداری زمانمان بین و لە هەموو دیزان نەبینە ئەسکوێ ، چونکە : ( من حسن اسلام المرء تركه مالايعنيه ) رواه مسلم واحمد .

وە هەتا دەتوانین با قسە خـــۆش و زمان شیرین بین ، چونکە زوربـــەی هەرەزۆری کێشەو دووبەرەکیو کینـــەو

بوغزو نێوان تێکچوون بەهۆی قسەی توندو ڕەق و زمانی تیژەوەیە .

لەکۆتاییدا :

لەخوای بەرزو مەزن و میهرەبان و ئاکارپەسند دەپاڕێمەوە کە بمانگێڕێ بە شوێن کەوتووی ڕاستەقینەی خەت و ڕێبازی پێغەمبەرە ڕەوشت مەزنەکەی و، یارمەتیمان بدات کە بەهۆی پاراستن و چاودێری کردنی دڵ و زمان و ئەندامە - کانی دیکەمانەوە خۆمان لە خوو و خدەی بەدو ناشیرین قوتاربکەین و، خوو و خدەو ئاکارو ڕەوشتە بەرزو جوانەکان لەخۆماندا بێنینەدی .

بەندی پێنجەم

## جیهادکردنێکی مەردانە

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست !

جیهادکردنێکی مەردانە پێنجەمین بنچینەو هێڵی ئیشتی ڕێبازی پێغەمبەرە جا هەرچەندە وەک پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: لووتکەی هەرە بەرزی ئیسلام جیهادە (ذروة سنام الاسلام الجهاد) رواه الطبرانی . وە لەدوای بڕواهێنان لە هەموو شتێک گەورەترو چاکترەو پاداشتی بترە ، وەک بوخاری و موسلیم خوا لێیان خۆش بێ بۆمان دەگێڕنەوە، کە پرسیار لە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم کرا ( ای العمل افضل ؟) چ کردەوەیەک - لە هەموو شتێک - چاکترە؟ ئەویش فەرمووی (ایمان باللە ورسولە) بڕوا هێنان بەخواو بە پێغەمبەرەکەی ، گوترا ئەدی دوای وی ؟ فەرمووی ( الجهاد فی سبیل اللە ) جیهادکردن لەپێناوی خوادا

بەڵێ هەرچەندە ئەمە پلەوپایەی جیهادە لە ئیسلامدا کە بە لووتکەی هەرەبەرزی و گەورەترین و چاکترین کردەوەی دانراوە بەڵام ئێمە لەبەر دوو هۆی گرنگ خستمانە دوای چوار بنچینەکانی پێشووی :

یەکەم : چونکە من کە ویستم پێناسەی ( رێبازی پێغەمبەر ) بکەم درووشم و بنچینەو هێڵە گشتییەکانی لەچەند خاڵێکی کورت دا بخەمەروو ، بەگشتی ، بەچاوی عەقڵ و دڵ و لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت دا سەرنجی ئیسلامم دا ، تەماشام کرد سەرلەبەری ئیسلام بە وردو درشتەوە بۆ ئەوە هاتوە کە مرۆڤ پێشەکی بۆخۆی لەخۆی دا چاک بێ ، ئنجا پاشان هەوڵی چاککردنی خەڵک و دەوروبەریشی بدات ، ئنجا جارێکی دیکە بەقووڵی سەرنجی دەقەکانی قورئان و سوننەتم دا ، داخوا چ رێیەکی دیاری کردوەو هەڵبژاردوە بۆئەوەی ئینسان

خوّی لەخوّی دا ( چاک ) بیّ، سەرەنجـــام گەیشتمە ئەو قەناعەتە کە ئیســـلام و ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چوار بنچینەی سەرەکییان دیاری کردوون کە وەک چەند ئالّقەیەک بەدوای یەک دا دیّن و هەرکامێکیان ئەوەی دوای خـــۆی پەلکێش دەکات و بەرهەمی دێنـــــیّ و دەیرەخسێنیّ :

تیّڕوانینێکی ژیرانە ـــــ بیروبڕوایەکـی ئیسلامییانە ـــــ خواپەرستییەکـــــی صالّحانە ـــــ خوو و ڕەوشتێکی خواییانە .

ئنجا سەرنجمدا داخوا ڕێبـــــازی پێغەمبەر چ ڕێ یەکی دیاری کردوە بـــۆ ئەوەی کە مروڤێکی ( چاک ) بتوانـــــێ خەلّک و دەوروبەری پیّ چاک بێ، لــــە ئاکامدا زانیم کە بەبیّ جوولاّن و ئیـــش کردن و ڕەنجدان مرۆڤ هەرچەندە زۆریـــش ( چاک ) بیّ هیچی لەدەست نایەت ، هـەر بۆیەش خودا فەرموویەتی :

( وقل اعملوا فسیری الله عملکـــــم

ورسوله والمؤمنون ) التوبه/ ١٠٥ .

ئنجا ئەو جموجۆڵ و چالاکـــــی و ئیش کردنەش ناوی تێکوشان( الجهاد ) ی بۆ هەلبژێرراوە، ئەمیش وەک راغـــب الاصفهانی دەڵێ یانی: ( استفراغ الوسع فی مدافعة العدو) ئەوپەری توانـــا بەکارهێنان لە بەرپەرچدانـــــەوەی دوژمن دا، کەواتە دەبێ پێنجەمیـــن بنچینەو هێڵی گشتی ئەو رێبـــازو بەرنامەیەی کە بۆ ئەوە هاتوە خەڵکێک باربێنێ کە چاک ( صالح ) و چاککــەر ( مصلح ) بن، جیهادکردن بێ، بەلام نەک هەموو جۆرە جیهادێک بەڵکو جیهادکردنێکی مەردانە !!

دووەم: بێگومان یاسایەکی گشتی یە لە تەواوی بوونەوەردا کە هەموو شتێـک لە ساوایی یەوە بەرەو هەراش بـــوون و مرازووبوون و، لە بێ هێزی یەوە بەرەو هێزو توانا و، لە نزمی یەوە بەرەو بەرزی دەچێ، ئنجا وەک گوتراش ( جیهاد ) بـە

گەورەترین و چاکترین کردەوەو، بـــە چڵەپۆپەو دوندی(1) هەرەبڵێندی ئیسلام لەقەڵەمدراوە، کەواتە شتێکی سروشتیو چاوەڕوان کراوە کە مرۆڤی موسڵمان ئەو گەورەترین ئەرک و چاکترین کردەوەیەی بۆ ئەنجام نادرێ و، دەستی پێ لـــەو لووتکە هەرەبەرزە گیر ناکرێ، هەتـــا چەندان هەنگاوی دیکە هەڵنەیەنێتەوەو چەندان قۆناغی دیکە نەبڕێ کە دەبنـــە پێشەکیو ڕێ خۆشکردن بۆ هێنانەدی ئـەو ئامانجە بەرزو بەزەحمەتە!

کەواتە زۆر شتێکی بەجێو ماقووڵـــە کە بەرلەوەی بێینەسەر باســـــی (جیهادکردنێکی مەردانە) چـــــوار قۆناغەکانی پێشووی بخەینەڕوو، بــۆ ئەوەی باباى ڕێبوار (سالِكٌ)ی ڕێی خوا هەموو قۆناغەکانی ڕێی ناوبراوی بەڕیز لەبەرچاو بن بەرلەوەی بکەوێتە ڕێ!

---

(1) دوندی بڵێند : لووتکەی بەرز .

بەڵێ جیهادکردن خەسڵەتێکە کە میوەو بەرهەمو ئەنجامی چەندان خەسڵەتی دیکەی بەرزو پەسندەو، لووتکەیەکی هێندە بەرزو دوورە دەستە کە هەموو کەس ڕێ ی ناکەوێ خۆی بگەیەنێتێ و، کەسێک لەوە دەوەشێتەوە کە خۆی بگەیەنێتە پلەوپایەی ناوبراو، کە لە هەموو ئاوان بەرێبێتەوەو، بەهۆی بەڕێوەبردنی یاساو دەستوورە حوزاو جۆرەکانی ئیسلام تەواو تەواو بۆ خوا ساغ بوۆبێتەوەو لە کلّ هاتبێتەدەرێ و، هێندە لەخوا وەنیزیک کەوتبێو هێندە بەزەبیو لوتف و بەخششی خوای وەبەر کەوتبێ کە پشکی غەیری خوای پێوەنەمابێ هەربۆیەش رابەری رەندو پێشەوای ئاکار پەسندمان صلّی الله علیه وسلّم فەرموویەتی :( ذروة سنام الاسلام الجهاد، ولاینا له الا افضلهم) رواه الطبراني . واتە : لووتکەی هەرەبەرزی ئیسلام جیهادەو، چاکترینیشیان نەبێ دەستی نایگاتێ !

کەواتە :

مسوڵمانی سەنگین و شیرین !

بەوە فربو مەخۆ کە ئەمڕۆ وشەی ( جیهادو غەزا لەپێناوی خوادا ) لەنێو مسوڵمانان دا بۆتە شتێکی نامۆ ( غریب ) و سەیر، وە بەوە هەڵمەخەڵەتێ کە هەندێک دەروون بەزیوان دەبینی دەستیان لە کەراسی دەرهێناون و بۆ پاکانە ( تبریر ) ی هەڵوێستی بەزیوانەو ترسنۆکانەیان ، خۆیان دووچاری تاوانی بە ( نارەوا ) یان بە ( نەگونجاو ) لەقەڵەمدانی جیهاد (1) کردوەو ، وەک ئەو کەسەیان لێهاتوە کە کارێکی بێ شەرعیو خراپی کرد بەڵام کاتێک گلەیی لێکرا عوزرێکی هێندە بێ جێی هێنایەوە کە لە کارە خراپەکەی خراپتر بوو، ئیدی لەوەوە پەندی " عوزر لە قەباحەتێ خراپتر" داکەوت !

---

(1) چونکە ئەوانەی کە لەم ڕۆژگارەدا

........................................

لەگەڵ جیهاد دانین دوو بەشـــن ، بەشێکیان هەر لە ئەسڵ دا (جیهاد) یان پێ شتێکی ناڕەواو هەڵەیەو پێیــان وایە واقیعی ئێستا لە ڕێ یەکی دیکەی غەیری جیهادەوە دەگۆڕێ !

وە بەشێکیشیان بڕوایان پێ یە بەڵام دەڵێن جارێ لەم بارودۆخـــە دژوارو ناهەموارەدا .. یان .. یان .. (جیهاد) ناگونجێ بکرێ ! بێ هەواڵ لەوەی کە هیچ کاتێک پێغەمبەرانی خوا علیهم السلام چاوەڕێ ی ئەوەیان نەکردوە واقیعـــی دژوارو نالەبار لەبارو هەموار بـــێ، بەڵکو بۆ خۆیان ناوی خوایان لـــێ هێناوەو خەریکی گۆڕین و چاککردنـــی بوو ون !!

خوای کاربەجێش بە ڕاشکاوی و بێ پێچ و پەنا لەوبارەوە فەرموویەتی:

( .. ان الله لایغیّر ما بقوم حتـــّى یغیروا ما بانفسهم ) الرعد / ١١ .

واتە :

بێگومان خوا حاڵ و واقیعی هیـــچ کۆمەڵێک ناگۆڕێ ، هەتا ئەوان واقیعـی دەروونی خۆیان نەگۆڕن !

وەک دەبینین گۆڕینی واقیعی ژیـــان لەلایەن خواوە ئەنجامو بەرهەمـــــی گۆڕینی حاڵ و وەزعی خۆ ( ذات ) یـــە لەلایەن خەڵکی یەوە !!

چونکە هەرکەسێک کتێبی خواو خەت و
ڕێ و شوێنی پێغەمبەرو هاوەڵانی و،
قسەو هەڵوێستی مەردانەی زانا و
چاوساغانی میراتگری پێغەمبەر صلی اللە
علیە وسلم بکاتە سەنگی مەحەک و تەرازوو
ئەوە بێ پێچوپەنا بۆی دەردەکەوێ کە
ڕاستە جیهادکردن گەورەترین و چاکترین
کردەوەیەو چڵەپۆپەی درەختی ئیسلامە !
سەرنجی قورئانێ بدە ! بزانە چۆن
لە شێوە تەعبیری جۆراوجۆردا ڕوو لە
مسوڵمانان دەکات کە لە ڕێی خوادا
بجەنگن و تێبکۆشن :
( اذن للذین یقاتلون بانهم ظلموا .. )
الحج / ٣٥ .
( ومالکم لاتقاتلون فی سبیل اللە
والمستضعفین ..؟) النساء / ٧٥ .
( وجاهدوا فی اللە حق جهادە )
الحج / ٧٨ .
( وقاتلوا فی سبیل اللە الذین
یقاتلونکم ..) البقرە / ١٩٠ .

( الا تقاتلون قوما نكثوا ايمانهم ..)
التوبه / ١٣ .
( يا ايها النبي حرّض المومنين على القتال ..) الانفال / ٦٥ .
( يا ايها النبي جاهد الكفار والمنافقين واغلظ عليهم ..) التوبه / ٧٣ .
( يا ايها الذين آمنوا قاتلوا الذين يلونكم من الكفار وليجدوا فيكم غلظه واعلموا ان الله مع المتقين )
التوبه / ١٢٣ .

وه له ژیانی پێغه‌مبه‌رو صلی الله علیه وسلم هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌كانی یه‌وه رضی الله عنهم ڕامێنه ! بزانه چۆن هه‌ر له سه‌ره‌تاوه هه‌تا دواهه‌ناسه‌ی ژیانیان هه‌موو ژیانیان بریتی بووه له خه‌بات و تێكوشان و جه‌نگ و خۆپێدادانی بێ پسانه‌وه‌و بێ وچان !

وه ته‌ماشای سه‌رگوزشته‌و ژیانی مه‌ردانی خواو جێگرو میراتگرانی ڕه‌سه‌نی پێغه‌مبه‌ری پێشه‌وا بكه ! بزانه

چۆن لەسەر ڕاست ڕاگەیاندنی بەرنامەی خواو چاک بەڕێوەبردنی ڕێبازی ( محمد المصطفى) ، هەموو ژیانیان بریتی بووە لە ئێش و ژان و کوێرەوەری و گیران و دەرکران و لێدران و شەهیدکران و، وشەی جیهادو بەرهەڵستی ( مقاومە ) و بەرەنگاری و مەردایەتی، بە خەتی درشت لەسەر ڕووپەڕی ژیانیان نووسراوەو بۆتە دروشم و نازناویان !

کەواتە :

هەرکەسێک خۆی بە شوێنکەوتووی کتێبی خواو ڕێڕەو ( سالک ) ی ڕێی پێغەمبەری ( مصطفى) و برادەرە بەڕێزە پارێزکارو فیداکارەکانیەو، قوتابیی قوتابخانەی زاناو چاوساغانی ڕەسەن لەقەڵەم بدات ، دەبێ ناوی خۆی لە لیستەی تێکۆشەرو جەنگاوەرانی ڕێی خوادا تۆمار بکات .

ئێستاش با نەختێک مەبەستی خۆم لە بەکارهێنانی وشەی ( جیهادکردنێکی مەردانە ) ڕوون بکەمەوە :

مه‌به‌ستم له جیهادکردنی مه‌ردانـــه
ئه‌وه‌یه که بابای مسولْمانی تیْکوشـــه‌ر
دوو مه‌رجی تیْدا بن :
۱- تاقه پالْنه‌رو هانده‌ریْک کـــــه
ده‌یجوولیْنیْو وای لیْ ده‌کات به‌ناوی
ئیسلامه‌وه بجه‌نگیْو خه‌بات بکات ته‌نیا و
ته‌نیا رِازی کردنی خوا بیْت به‌هـــوْی
لابردنی سته‌م و خراپه‌و بیْ شه‌رعـــی و
چه‌سپاندنی حوکم و به‌رنامه‌ی خوا لـــه
زه‌وی دا ، چونکه پیْغه‌مبه‌رمان صلـــی
الله علیه وسلم له وه‌لاّمی که‌سیْک دا که
لیْی پرسی چ جوْره جیهادیْک لـــه رِیْ ی
خوادایه ؟ فه‌رمووی :
( من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا
فهو في سبيل الله ) متفق عليه .
۲- خه‌بات و تیْکوشان و جه‌نگه‌کـــه‌ی
دریْژخایه‌ن و بیْ پسانه‌وه بـــیْو ،
ساردبوونه‌وه‌و پاشه‌کشه‌ی تیْدا نه‌بـــیْ ،
وه‌ک خوا له وه‌سفی هاوه‌لْه به‌رِیْزه‌کانـــی
پیْغه‌مبه‌ردا فه‌رموویه‌تی :

( من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه فمنهم من قضى نحبه ومنهم من ينتظر وما بدلوا تبديلا ) الاحزاب /٢٣
واته: لەنێو برواداران دا پیاوانێک هەن کە لەو پەیمانەدا کە لەگەڵ خوادا بەستوویانە راستیان کردوە، جا هەیانە کاری خۆی بەجێ هێناوەو شەهیدبووە ـ وە هەشیانە چاوەڕێ یە، رە یەک تۆزیان لەو بەڵێنە نەگۆڕیوە ..
بەڵێ بروادارانیش وەک پەنجەی دەستان بەرزی و نزمیان هەیە، مەردیان هەیەو، نیمچەمەردیان هەیەو، هەشیانە مەردایەتی‌یەکەی زۆر کزەو ... هتد .
جا ( مەردی خوا ) ئەودیە کە، بۆخوا بجوولێ‌و هەتا دوا تنۆکیش بجوولێ‌و، قەت پاشەکشە نەکات و پاش لە دوژمن نەکات.

ئێستاش با سەرنجێکی خێرا لە چۆنەتی پێکەوە پەیوەستی‌و یەکتەر

پەلکێش کردنی ئەو پێنج بنچینەو هێڵە گشتییانەی ڕێبازی پێغەمبەر صلی اللـه علیه وسلم بدەین !

( تێڕوانینێکی ژیرانە ) لە بوونەوەرو دەوروبەر لە ڕێ ی پێنج هەستەکان و عەقڵ و دڵەوە، مرۆڤ وا لێ دەکات کە ( بیروباوەڕێکی ئیسلامی یانە ) هەڵبژێرێ، چونکە بەس لەبەر تیشکی بیروبڕوایەکی وادا مرۆڤ دەتوانێ تەفسیرێکی ڕاست و بەجێ بۆ هۆو حیکمەت و چۆنیەتی پەیدابوونی بوونەوەرو ژیان و ئینسان بکات. ئنجا مرۆڤ پاش وەرگرتنی بیروبڕوای ناوبراوو هەزمکردنی یەکسەر ( خواپەرستی یەکی ساڵحانە ) ی تێدا پەیدادەبێ‌و، کە هەتا ئێستا ڕێبواری ڕێ ی ناسینی بوونەوەرو دەوروبەر بووە، ئەمجار دەبێتە ڕێبواری ڕێ ی ناسینی خوای میهرەبان و دادگەر، پاشان درەختی خواپەرستی میوەی ( خوو و ڕەوشتێکی

خوایی یانە ) دەردەکات ، چونکە هەر کاتێک مرۆڤ بەڕاستی خوای پەرست و لێی وەنیزیک کەوت دەکەوێتە ژێر تەئسیری ڕووناکی جوانیو هەیبەتی ( الجمال والجلال ) ی یەوەو لە دەریای بێسنووری سیفەتە بەرزو پەسندەکانی خودا جل جلالە دڵۆپەیەکی پێدەبڕێ و بەمراد دەگات و قۆناغی پاک بوونەوەو ڕازانەوە ( التخلیە والتحلیە ) هەڵدەبوێرێ و ، ڕۆژ بۆ ڕۆژێ ڕەوشت و خوو خدەو ئاکاری جوانتر دەبێو هەڵس و کەوتی لەگەڵ خەڵکیو لەگەڵ دەوروبەری دا چاکتر دەبێ .

ئنجا پاش تەواوکردنی چوار قۆناغی پێشوو ، واتە دوای ئەوەی بوو بە بابایەکی :

( ژیری ئیسلامی ساڵحی خودایی ) وەک گوتراوە :

" تیغی ڕەسەن خۆی لە کالانێدا ڕاناگرێ "

بۆیە بەرەو قۆناغی پێنجەمو کۆتایی

( جیهادکردنێکی مەردانە ) خۆی دەکوتێ، تاکو هەروەک چۆن واقیعی خراب و بەدی دەروونی خۆی گۆڕی بۆ واقیعێکی چاک و پەسندو شەرعی، واقیعی خەڵـــــک و دەروبەریشی لە خراپەو ستەمو ناشەرعی - یەوە بگۆڕێ بۆ واقیعێکی چـــاک و دادگەرانەو ئیسلامی .

بەڵگەنەویستیشە کە ئەو واقیـــــع گۆڕین و ژێروژوورکردنە تاک و کۆمەڵ و دەرودەروون و وردو درشت و سیاسەت و عبادەت و ماددی و مەعنەوی و .. هتـد دەگرێتەوە ، چونکە ڕێبازی پێغەمبــــەر علیه الصلاة والسلام بەرنامەو پەیڕەوی سەرلەبەری ژیانەو، وا لە مرۆڤ دەکات کە لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا بـەس بەندەی خوا بێت و بەهۆی بت پەرستــی و طاغووت پەرستی یەوە گیـــــرۆدەی دەردی هاوبەش پەیداکردن ( الشرك ) نەبێــتە چونکە ؛ ( ان الله لایغفر ان یشرك بـه ویغفر مادون ذلك لمن یشاء )النساء /٤٨٠

لەکۆتاییدا :

لەخوا دەپارێینەوە کە بمانگێڕێ بە مسوڵمانێکی [1] ژیرو ئیسلامیو ساڵحو ڕەوشت بەرزو تێکۆشەرو مەرد .

ئەلێرەش کۆتایی بە بەشی یەکەمی ئەم نامیلکەیە دێنین ، چونکە لەبەر تیشکی ئەو پێنج بەندانەدا کە ڕابردن تا ڕاددەیەک سەروسیماو ماهیەتی ( ڕێبازی پێغەمبەر ) مان طلى اللـه علیه وسلم ناسی، کەواتە با ئەمجار بچینە سەر بەشی دووەمو لەوێشدا لە چەند بەندیکدا جۆرو چۆنیەتی ( بۆچوون و هەڵوێستەکانی) ڕێبازی پێغەمبەر طلى اللـه علیه وسلم بخەینەڕوو ، بۆئەوەی هەرکاتێک خۆمان بە شوێن کەوتووی ڕێبازی ناوبراو حسێب کرد ئاگادار بین بیروبۆچوون و

---

(١) چونکە مسوڵمانی ژیرو ناژیر ، ئیسلامیو نائیسلامی، ساڵحو ناساڵح ڕەوشت بەرزو ڕەوشت نزم، تێکۆشەرو

هەڵوێستێکی وا مان لێ نەپشکوێتەوە کە لەگەڵ ڕێبازی ناوبراودا نەگونجێ .



---

.....................................
هەڵخزاویش هەیە ! جا پێم وایە هەموو کەس دەزانێ مسوڵمانی کەودەن و ناساڵح وە ڕەوشت نزمو هەڵخزاو کێیەو چۆنە ، بەڵام ڕەنگە هەموو کەس نەزانێ مەبەستم لە ( مسوڵمانی نائیسلامی ) چی یە ؟!
بۆیە دەڵێم :

مسوڵمانی نائیسلامی ئەو مسوڵمانە سەرگەردان و فەقیرحاڵ و سەربەهەشەیە کە بەرنامەو ڕێبازی خواو پێغەمبەرەکەی لەوێ یە ، کەچی ئەو پەنادەباتە بەر ڕێچکەو مێچکەی جۆراوجۆری لەخوادووری خوازراو ( مستعار ) لە شەیتانە ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاوایی و خۆماڵی‌یەکانەوە .

هەڵبەتە ئەم بەهەڵەداچوون و ڕێ لێ ون بوونەش لەوەوە سەری هەڵداوە کە بە هەڵە ئیسلامی لە جوغزێکی مەعنەوی و شەخسیدا کورت هەڵێناوە .

## بەشی دووەم

# بۆچوون و هەڵوێستەکان

## (الآراء والمواقف)

## ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

مسوڵمانی خۆشەویست و بەڕێز !

لەم بەشی دووەمەدا هەوڵ دەدەین بیروبۆچوون و هەڵوێستی شوێن کەوتووانی ڕێبازی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم لە حەوت بەندان دا سەبارەت بە حەوت مەسەلەی زۆر گرنگ بخەینە ڕوو :

لە بەندی یەکەمدا چۆنیەتی بۆچوون و هەڵوێستی شوێن کەوتووانی ڕێبازی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم دەربارەی قورئان و سوننەت ڕوون .... دەکەینەوە .

وە لە بەندی دووەمدا سەبارەت بە هەڵوێستی ڕاست و ساغ دەدوێین لەئاقار برادەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەردا صلی اللە علیە وسلم خوا لێیان ڕازی بێ .

بەندی سێیەمیش تەرخان دەکەین بۆ ڕوونکردنەوەی بۆچوون و هەڵوێستی

شوێن كەوتووانی ڕێبازی ناوبـــــراو لەبارەی زانابانی پێشینەوە خوا لێیان خۆش بێ .

لە بەندی چوارەمیش دا دەچینـــــە سەروكاری مەسەلەی مەزەبە شەرعی‌یەكـان ( المذاهب الفقهیە ) ، وە بۆچـــوون و هەڵوێستێك كە بە قەناعەت و بـــــڕوای ئێمە زادەو هەڵقوڵاوی سەرچاوەی ڕوون و سافی ڕێبازی پێغەمبەرە صلی اللە علیە وسلم ، دەیخەینەڕوو .

لە بەندی پێنجەمیش دا مەسەلـــــەی تەریقەت و سۆفیایەتی ( الطریقـــــــە والتصوف ) دێنینە سەر خوانـــــــــی لێكولینەوەو لە تەرازووی شوێن كەوتوو - انی ڕێبازی پێغەمبەردا صلی اللە علیە وسلم هەڵی دەسەنگێنین و ، بەچـــــاوی قورئان و سوننەت و شەرع تێبیـــــــەوە رادەمێنین .

لە بەندی شەشەمیش دا دێینە ســـەر باسی كۆمەڵ و جوولانەوەكان ، چ ئیسلامی

بن چ نائیسلامی ) وە بیروبۆچـــوون و هەڵوێستی تایبەتی خۆمان بە ڕاشکــاوی لەبارەیانەوە دەخەینەڕوو .

لە بەندی حەوتەمیش دا هەڵوێستـــی ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەربارەی ئوممەتی ئیسلامی یان ئەهلــی قیبلە دەخەینەڕوو .

ئنجا لەکۆتاییدا لەژێر سەرباســـی ( پاشکۆیەکی گرنگ ) دا هەشت مەسەلــەی زیندوو ( حیوی ) کە لەم سەردەمـــــەدا لەئارادا هەن ، دەتوێژینەوەو، لەبارەی هەر یەکێکیانەوە بۆچوون و هەڵوێستـــی ئیسلامییانەی خۆمان ڕادەگەیەنین ، کــە ئەمانەن :

| | |
|---|---|
| ١- زانیاری | ٢- سیاسەت |
| ٣- دادگەری | ٤- نەتەوایەتی |
| ٥- کورد | ٦- ئافرەت |
| ٧- ئازادی | ٨- بیدعەت |

## بەندی یەکەم
## قورئان و سوننەت

خوا پشتیوان بێ لەم چەند خاڵەی خوارێ دا بەکورتی بیروبۆچوون و هەڵوێستی خۆمان دەربارەی قورئان و سوننەت دەخەینەڕوو :

یەکەم: بێگومان ( قورئان ) قسەی خوای پەروەردگارەو ( سوننەت ) یش ڕێ و شوێن و پەیڕەوی پێغەمبەری سەردارە صلی الله علیه وسلم، مادام وابێ، ئەندازەی بڕواپێ بوون و ڕێزدانانمان بۆ قورئان و سوننەت بارتەقای بڕواپێ بوون و ڕێزگرتنمانە لە خواو پێغەمبەری نەخوێندەوارمان صلی الله علیه وسلم .

جا شوێن کەوتووی ڕێبازی موحەممەد صلی الله علیه وسلم پتەوترین بڕوای بە خوا هەیەو ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیو شەرمو سامی لەدڵ دایە سەبارەت بە

خوای بەرزو مەزن و، وە بڕوای بە ڕاستیەتی پێغەمبەران بەگشتیو ( محمد ) بەتایبەتی زۆر تایمەو، وە قەناعەتی تەواوی هەیە کە پێغەمبەرانی خوا علیهم السلام بێ هەڵەو پەڵەن و پارێزراو ( معصوم ) ن ، لە هەر تاوان و خراپەیەک کە لەگەڵ پلەوپایەی پێغەمبەرایەتیدا ناگونجێ .

دووەم : قورئان و سوننەت لەنێو بەڵگە شەرعیەکان ( الادلە الشرعیە ) دا دوو تاقە سەرچاوەی[1] ( متمانەپێکراوی تەواو ) و ( مشتومڕ هەڵنەگر ) و ( سەربەخۆ - مستقل ) ن .

بەلام غەیری وان ، وەک قسەی یارانی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم و قسەی پێشەوایانی کۆشش کەر ( الائمە

---

(١) ئەم قسەیە ( قد ضمن اللە لی العصمة فی الکتاب والسنە ولم یضمنها لی فی سواهما ) درووشمی زانایانی پێشوومان بووە ، خوا لێیان خۆش بێ .

المجتهدون ) وانين .

سێیەم: هەرکەسێک ئینکاری حوکمێک بکات کە قورئان و سوننەت بە دەقێکی متمانەداری تەواو و بێ پێچوپەنا ( قطعي الورود قطعي الدلالە ) فەرمانیان پێ کردبێ، ئەوە لە ریزی مسوڵمانان دەچێتەدەرێ(۱)

چوارەم: قورئان و سوننەت تەرازووی ئیسلامەتیو سەنگی مەحەکی قسەو بریاری هەموو زاناو پێشەوایانن ،وە لە هەر شتێکدا کێشەمان بۆ هاتە پێشێ دەبێ بگەرێینەوە بۆ لای وان ، وە قسەو بریاری هەرکەسێکیش هەرچەندە یەکجار پایەبەرزو بەرێزبێ بەس بە ئەندازەی نیزیکیو سەرچاوەگرتنی لە قورئان و سوننەتەوە ریزی لێ دەگیرێ و ئیعتیباری پێ دەکرێ .(۲)

---

(۱) ( قل اطيعوا الله والرسول فان تولوا فان الله لايحب الكافرين ) آل عمران / ۳۲ . تێ بینی : مەبەست

..................................

لە فەرمایشەری خواو پێغەمبەر ( اطاعة الله والرسول ) لێرەو لە هەر شوێنێکی دیکەی قورئان و سوننەتدا ، پابەند بوونە بە قورئان و سوننەتەوە ، ئەمە رای تێکرای زانایانی لەسەرە ، بۆ وێنە بڕوانە ( فتح الباری شرح صحیح البخاری) ابن حجر العسقلانی ج١٣ ص١٩٥ ، وە بڕوانە ( الجامع لاحکام القرآن) للقرطبی ج٣ ص ٢٦١ ، هەروەها هەرکام لە ( ابن کثیر ) و ( الشوکانی) و ( بیضاوی )و ( طباطبائی) یش هەمان رایان هەیە ، بڕوانە تەفسیری ( ابن کثیر ) ج ١ ص ٥١٧ وە ( فتح القدیر ) ج١ ص ٤٨٠ ، وە ( انوار التنزیل) ج١ ص ٢٦٦ ، وە ( المیزان) ج٤ ص ٣٨٨ .

ئاگاداری :

هەڵبەتە ئەوەی کە مرۆڤ بە ئینکاری کردنی کافر دەبێ مەرج نیە هەر دەقی قورئان و سوننەتیش بێ ، بەڵکو هەرشتێک بە بەشێکی پێویست و ئاشکرای ئیسلام زانرا مرۆڤ بە ئینکاری کردنی کافر دەبێ ، بڕوانە ( جمع الجوامع ) لابن السبکی / ج٢ ص٢٠١ .

(٢) ئیمامی مالیک فەرموویەتی : ( کل احد یوخذ من قوله ویرد علیه الا صاحب هذا القبر صلی الله علیه وسلم ) بڕوانە ( کشف الخفا ومزیل الالباس ) ج٢ ص ١٥٥ .

پێنجەم: سوننەتی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم کە فەرموودەکانی و کردەوەکانیو بڕیار لەسەردانەکان ( تقریرات ) ی دەگرێتەوە، شەرح و لێکدانەوەی قورئانە: ( .. وانزلنا الیک الذکر لتبین للناس ما نزل الیهم ) النحل / ٤٤ .

کەواتە: نابێ هیچ سوننەتێکی ڕاستی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم لەگەڵ دەقەکانی قورئان و ڕووحی قورئان دا تێک بگیرێ ، هەرکاتێکیش شتێکی وا ڕووی داو بەهۆی ( تأویل ) کردنەوە - ئەگەر تەئویلی هەڵدەگرت - شتەکە چارەسەربوو ئەوە باشە، دەنا ناچارین حوکمی هەڵبەستران ( وضع ) بەسەر ئەو بەناو سوننەتە دابدەین ، چونکە مەحاڵە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم حوکمو بڕیارێکی هەبێ پێچەوانەی حوکمو بڕیاری خوا . (١)

---

(١) کەواتە ئەوە کە زانایانی

..................................

فەرموودەناس گوتوویانە (1) فەرموودەی ( ما اتاكم عنى فاعرضوه على كتاب الله فان وافق كتاب الله فانا قلته وان خالف فلم اقله ) رواه الطبرانى عن ثوبان ، فەرموودەیەكی درۆو هەڵبەستراوەو ئی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نیە ، زیان لە ڕاستی ئەو یاسایە نادات كە گوتمان .

جونكە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وای فەرمووبێ یان نا دەبێ هەروابێ ، بەلاَم گرنگ ئەوەیە تەواو تەواو دڵنیا بین كە بەڕاستی سوننەت ( قول ، فعل تقریر ) ەكە لەگەڵ قورئان دا دژایەتی هەیەو ناگونجێ ، ئەمەش بە زانایانی قووڵ و ڕۆچوو ( راسخ ) نەبێ ساغ ناكرێتەوە ، ئەوانەی كە شارەزایی چاكیان لە ( ناسخ و منسوخ ) ، ( مجمل ومفصل ) ، ( عام و خاص ) ، ( مطلق و مقید ) ، ( منطوق و مفهوم ) ، ( تعارض و ترجیح ) ، و .. هتد دا هەیە .

---

(1) بڕوانە ( ارشاد الفحول الى تحقيق الحق من علم الاصول ) محمد بن على الشوكانى / ص ٢٩ .

ئەم ئایەتە تێکڕای هاوەڵانـــــی پێغەمبەر خوا لێیان ڕازی بـــــێ دەگرێتەوە، چونکە ئەو بەڕێزانە ســێ بەش بوون :

١- کۆچکەران ، کە لە شاری مەککـــەوە کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینە .

٢- پشتیوانان ، کە خەڵکی شاری مەدینە بوون و بوونە پشتیوانی پێغەمبەرو ئیسلام .

٣- ئەوانەی لەدوای وان مسوڵمان بوونو بەچاکی ڕێبازی وانیان گرت ، کــە بەزۆری لەپاش گرتنی شاری مەککــــە مسوڵمان بوون .

سێ: ( محمد رسول الله والذين معـه اشداء على الكفار رحماء بينهـم تراهم ركعا سجدا يبتغون فضلا من اللـه ورضوانا ..) محمد / ٢٩ .

لەم ئایەتەشدا کە ئێمە بەشێکیمان نووسی گەورەترین مەدحی تێکـــڕای هاوەڵانی پێغەمبەر کراوە، خوا لێیـان ڕازی بێ .

پیغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرموودەی لەوبارەوە زۆرن، بۆ وێنە :

چوار : ( الله الله فی اصحابی ؛ لاتتخذوهم غرضاً بعدی ، فمن احبهم فبحبی احبهم ، ومن ابغضهم فببغضی ابغضهم ..) رواه الترمذی وقال حسن .

پێنج : ( دعوا لی اصحابی ؛ فوالذی نفسی بیده لو انفقتم مثل احد ذهبا مابلغتم اعمالهم ) رواه احمد ورمز السیوطی لصحته .

ئەمە دەربارەی هاوەڵان ( الاصحاب ) بەگشتی ، دەربارەی چوار جێ نشینە - کانیشی فەرموویەتی :

شەش : ( .. فعلیکم بسنتی وسنه الخلفاء الراشدین المهدیین من بعدی عضوا علیها بالنواجذ ....) رواه الترمذی وابوداوود .

جا خوێنەری بەرێز !

دەبێ چ مسوڵمانێک هەبێ خۆی بە شوێن کەوتووی بەرنامەی خواو رێبازی

پێغەمبەری پێشەوا بزانێ، بشزانێ کە خواو پێغەمبەرەکەی صلی اللە علیە وسلم ئاوا رێزیان لە هاوەڵانی پێغەمبەر گرتوەو رەزامەندی یان دەربارە دەربریون ئەویش پربەدڵ ئەو زاتە بەرزانەی خۆش ئەوێن و ناحەزو دوژمنانیان نەبوغزێنێ !

بەڵام نابێ لە چەند راستی یەکیش بێ ئاگا بین :

یەکەم : هاوەڵانی پێغەمبەر خوا لێیان رازی بێ هەموویان لە یەک پلەدا نین ، بەڵکو جۆرا وجۆرن و بەرزی و نزمی زۆریشیان لەنێوان دا هەیە ، خوای بەرزو مەزنیش بۆخۆی فەرموویەتی :

( .. لایستوی منکم من انفق من قبل الفتح وقاتل اولئک اعظم درجە من الذین انفقوا من بعد وقاتلوا وکلا وعد اللە الحسنی ..) الحدید / ١٠ .

دووەم : رێزو حورمەت دانانمان بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر بە تێکرایی ،

ئەوە ناگەیەنێ کە هیچ کامیـــــان
- چ جای هەموویان - لە هەڵە پارێزراو
( معصوم ) بوو ون ، چونکە جگە لـــە
پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هیچ کەس
لە هەڵە پارێزراو نیە .
سێیەم : نابێ ڕێزگرتنمان بۆ زاتـــە
بەرزانە لە سنوور بچێتەدەرێ و لـــە
مافی خۆیان زیاتریان بدەینێ، یـــان
چاو لە هەڵەو تاوانی هەندێکیـــان
بپۆشین ، بەتایبەتی ئەوانەیان کـــە
بەهۆی هەڵەو خراپەی وانەوە موسڵمانان
پێک وەربوون و ، ئیسلامیش لەسەر خەت و
پەیرەوی جێ نشینایەتی ڕاست ( نهـــج
الخلافە الراشدە ) ترازاو ئوممەتـــی
ئیسلامی دووچاری دەیان دەردو نەخۆشـــی
وابوو کە ئێستاش پێیانەوە دەناڵێنین.
چوارەم : ئەم قسەیەی عومەری کـــوڕی
عەبدولعەزیز : ( تلک دماء طهر الله منها
ایدینا فلا نلوث بها السنتنـــا )
دەربارەی تانەوتەشەر نەدان لـــە

هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، زۆر جوانە بەڵام هیچ ماقووڵیش نیە بەو بەهانەیەوە گوێ نەدەینە لێکوڵینەوەو توێژینەوەی مێژووی ئیسلام و هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی هاوەڵە بەڕێزەکان و لێک جوێ کردنەوەی هەق و ناهەق!

بەڵێ من لەگەڵ هەموو ڕێزێکمدا بۆ زانایانی پێشینمان بەهیچ ڕەنگێک قسەی ( ونمسک عما جری بین الصحابة ونری الکل ماجورین)[1] بۆ هەزم ناکرێ مەگەر بۆ خەڵکی عەوام و ڕەشۆکی!!

تێ بینی :

١- ئەدەبێکی ئیسلامی بەرزە کە لەکاتی ناوهێنانی یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەردا رضی الله عنهم بگوترێ ( رضی الله عنه ) یان خوا لێی ڕازی بێ

---

(١) بڕوانە ( جمع الجوامع ) ج٢ ص٤٢٢ وە ص ٤٢٣ . تاج الدین عبدالوهاب ابن السبکی .

هەڵبەتە ئی واشیان هەیە کە من لەکاتی ناوهێنانیدا گوتنی ( رحمه الله ) یان ( غفر الله له ) م پێ چاکترو گونجاوترە !!

٢- دەربارەی حوکمی کەسێک کە جنێو بە یەکێک لە هاوەڵان دەدات زانایان ڕایان جوێ جوێ یە :

( فضیل بن عیاض ) فەرموویەتی : جەماوەر ڕایان وایە تەمبێ بکرێ ، هەندێک لە مالیکییەکانیش دەڵێن : دەبێ بکوژرێ ، بەڵام هەندێک لە شافیعییەکان ئەمەیان تایبەت کردوە بە کەسێکەوە کە جنێو بە ( ابوبكروعمر )یان ( حسن وحسین) بلێ، خوا لێیان ڕازی بێ بەڵام جەماوەر هەر لەسەر ئەوەن کە دەبێ تەمبێ بکرێ . (١)

---

(١) بڕوانە (فیض القدیر شرح الجامع الصغیر )ج٢ص٩٨ / للعلامە المناوی .

تێبینی: تەمبێکردن( تعزیر ) پلەو جۆری زۆرن، وەک : خۆ لێتوورەکردن، لێدان حەپس کردن .. ئەمیش بەپێی ڕای فەرمانڕەوا دیاری دەکرێ .

بەندی سێیەم
زانا و میراتگرانی ڕەسەنی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم

بیروبۆچوون و هەڵوێستمان دەربارەی زانایانیش دیسان لەبەر تیشکی قورئان و سوننەتدا دەخەینەڕوو :

خوای زانا و میهرەبان لە زۆر جێیان لە قورئانیدا مەدحی زانایانی کردوە، بۆ وێنە :

١-( قل هل یستوی الذین یعلمون والذین لایعلمون ؟! ..) الزمر / ٩ .

٢- ( یرفع اللە الذین آمنوا منکم والذین اوتوا العلم درجات .. ) المجادلە / ١١ .

٣- ( .. انما یخشی اللە من عبادە العلماء ..) فاطر / ٢٨ .

هەروەها پێغەمبەریشمان صلی اللە علیە وسلم لەوبارەوە فەرموودەی زۆرن، بۆ وێنە :

٤- فضل العالم علی العابد کفضلی

على ادناكم ..) رواه الترمذي وقال
حديث حسن .
٥- ( .. وان العلماء ورثة الانبياء
وان الانبياء لم يورثوا دينارا
ولا درهما وانما ورثوا العلم، فمن
اخذه اخذ بحظ وافر ) رواه ابوداوود
والترمذي .
٦- ( من يرد الله به خيرا يفقهه في
الدين ) متفق عليه .
بەڵێ هەڵوێستی ئێمەش دەربارەی
زانایانی ڕەسەن خوا لێیان خۆش بێ
هەمان هەڵوێستی خواو پێغەمبەرە صلی
الله علیه وسلم :
آ- لەگەڵ خەڵکی دیکەدا - کە نازانن -
یەکسان نین !
ب- لەلای خوا بە چەند پلان لە
بڕواداڕانی ئاسایی بەرزترن !
ج- هەر ئەوان وەک پێویست لە خوا
دەترسێن و شەرمی لێ دەکەن .
د- جیاوازی زانایانی ڕەسەن و

خواپەرستانی ئاسایی وەک جیاوازی نێوان پێغەمبەرو گچکەترین ساوەڵیەتی!

ﮬ ـ جێگرو میراتگری پێغەمبەرانن و، گەورەترین و چاکترین بەشیان پێ براوە ..

و ـ دیارە خوا خۆشی دەوێن و خێری هێناونە ڕێ، بۆیە لە بەرنامەی خۆی دا شارەزای کردوون .

ئنجا لەبەر تیشکی ئەم دەقانەو چەندان دەقی دیکەی ئاوادا دەڵێین :

یەک : پێویستە زاناو پێشەوایانی ئیسلام چ بە مردوویی و چ بە زیندوویی ئەوپەڕی ڕێزو حورمەتیان لێ بگیرێ و وەک خەڵکی ئاسایی ڕەفتاریان لەگەڵ نەکرێ، چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وایان تەماشا نەکردوون، وە بە ڕێزەوە ناویان بهێنرێ و داوای پلەی پاداشتی چاکیان بۆ لە خوا بکرێ(١)

---

(١) ئەدەبێکی ئیسلامی بەرزو جوانە کە لەکاتی ناوهێنانی زانایانی پێشین دا ئینسان بلێ خوا لێی خۆش بێ (رحمه الله).

دوو: دەبێ گومانی چاک ( حسن الظن ) یان پێ ببردرێ و، بزانرێ کە هیچ قسەیەکیان لە گیرفانی خۆیان دەرنەهێناوەو هیچ شتێکیان بە گوترە نەفەرمووەو، قسەی بێ بەڵگەو پاپشتیان نەکردوە، چونکە چۆن چاک و راستە هەر وا لەوان چاوەروان دەکرێ.

سێ: دەبێ مرۆڤ خۆشیو حەڵکیش بناسێ، هەر چونکە ئەویش وەک زانا و پێشەوایان ریش و سمێلی هەن خۆی لێ نەگۆڕێ و، وا بزانێ ئەویش وەک وانەو بلێ: ( هم رجال ونحن رجال ) چونکە ئەم قسەیە خۆی لەخۆی دا راستە بەلام ئەو بۆ ناهەق بەکاری دێنێ، ( کلمة حق یراد بها الباطل )، دەنا هەر لەنێو ریش و سمێڵداران دا پیاویش هەن و پیاویلکەش هەن!

بەلام نابێ لە چەند راستی یەکیش بێ ئاگا بین:

یەکەم: هەموو ئەو رێزو حورمەت لێگیرانو

مەدحکرانەی کە لە قورئان و سوننەتدا سەبارەت بە زانایان هەیە، مەبەست پێ زانایانی ڕاست و ساغو خودایی (ربانی) یە، دەنا هەر لە قورئان و سوننەتیش دا لە زۆر شوێنان دا زانایانی ناڕاستی دین فرۆش سەرزەنشت کراون و هێرشی توندیان کراوەتەسەرێ و بە خراپترین شێوە وەسف کراون و وە نزمترین[1] ئاژەڵ چوێنراون، بۆ وێنە:

١- ( مثل الذين حملوا التوراة ثم لم يحملوها كمثل الحمار يحمل اسفارا بئس مثل القوم الذين كذبوا بآيات الله ..) الجمعه / ٥ .

٢- ( واتل عليهم نبا الذى آتيناه آياتنا فانسلخ منها فاتبعه الشيطان فكان من الغاوين ، ولوشئنا

---

(١) وە نزمترین ئاژەڵ چوێنراون : یانی تەشبیهی نزمترین ئاژەڵ کراون، وێچواندن : تشبیه .

لرفعناه بها ولكنه أخلد الـــى الارض
واتبع هواه فمثله كمثل الكلـــب ...)
الاعراف / ١٧٥، ١٧٦ .
٣- ( ان الذين يكتمون ما انزل اللــه
من الكتاب ويشترون به ثمناً قليـــلا
اولئك ما ياكلون في بطونهم الا النـــار
ولايكلمهم الله يوم القيامة ولايزكّيهم
ولهم عذاب اليم ) البقره / ١٧٤ .
٤- پێغهمبهریشمان صلى الله عليه وسلم
فهرموویهتی : ( من تعلم علما ممـــا
يبتغى به وجه الله عزوجل لايتعلمه الا
ليصيب به عرضاً من الدنيا لم يجد عـــرف
الجنه يوم القيامه ) رواه ابـــوداوود
باسناد صحيح .
٥- وه فهرموویهتی: ( .. حتى اذا لـــم
يبق عالما اتخذ الناس رؤساً جهالا ،
فسئلوا فأفتوا بغير علم ، فضلـــــوا
واضلوا ) متفق عليه .
٦- دیسان فهرموویهتی : ( من سئل عـــن
علم فكتمه الجم يوم القيامه بلجام

من النار ) رواه أبوداوود والترمذي وقال حسن .

بەڵێ :

آ- هەرکەسێک لە بەرگی پێشەوایەتی دا بێو ئەرکی خۆی جێبەجێ نەکات وەک کەرێک وایە کە بارە کتێبێکی هەڵگرتوە !

ب- وە هەرکەسێک لەبەر رابواردن و تەماعی دنیا یاساکانی بەرنامەی خوا پشت گوێ بخات وەک سەگی ئێسک بەدەمەوە گرتوو وایە !

ح- وە هەرکەسێک بەرنامەی خوا بشارێتەوەو بە نرخێکی کەم بیفرۆشێ - کە مەبەست بەرژەوەندی دنیایە- ئەوە ئاگر لە زگی خۆی دەئاخنێو .. هتد .

د- وە هەرکەسێک بۆ ئەوە لە بەرنامەی خوادا شارەزا بێ هەتا بەرژەوەندی ژیانی دنیای دابین بکات بۆنی بەهەشتێ ناکات !

هـ- وە بەتاوزانایانی نەزان ، سەر لە خۆیان و خەڵکیش دەشێوێنن !

و- وە هەرکەسێک زانیاری دەربارەی بەرنامەی خوا هەبێو لێی بپرسرێ و بیشارێتەوە، بە لغاوێکی ئاگرین لغاو دەکرێ!

دووەم: نابێ ڕێزگرتنمان لە زانایان لە سنووری خۆی بچێتەدەرێ، بەوەی کە بەبێ هەڵە (معصوم) یان لەقەڵەم بدەین، یان قسەو بڕیارەکانیان وەک دەقی قورئان و سوننەت بێ چەندو چوون وەربگرین، چونکە هیچ زانایەکی ڕاستەقینە قایل نابێ ئاوا ڕەفتار لەگەڵ قسەو بیروبۆچوونەکانیدا بکرێ.

سێیەم: نابێ هیچ زانایەک هەرچەندە پایەبەرزو مەزن بێ، پایەبەرزی - یەکەی وامان لێ بکات نەتوانین قسەو بۆچوونەکانی بە تەرازووی قورئان و سوننەت هەڵسەنگێنین و، بەرهەمەکەی بە بێژبنگی تێوەڕامان و وردبوونەوەی خۆمان لە بێژینگ بدەین..

بەڵام گرنگ، ئەوەیە خۆمان و[1] خەڵکیش بناسین و بزانین کە هەڵسەنگاندن و لەبێژینگدانیش لە هەموو کەس ناوەشێتەوەو، جاری واش هەیە بیرو زەینی ناتەواوی خۆمان شتێکمان بە هەڵە دێنێتە بەرچاو، دەنا تێروتەواوە، وە گرنگ ئەوەیە کە هێندەمان گومانی چاک و متمانەی عاقڵانە بە زانایانی ڕەسەن هەبێ کە ئەگەر تەواوتەواو دڵنیا نەبیس لە هەڵەیی قسەیەکیان لەخۆوە هەبکەینە گاڵە !!

---

(١) باشترین ڕێگەش بۆ خۆناسین و خەڵک ناسین، کە لێرەدا مەبەستم زانایانن، ئەوەیە کە مرۆڤ بەرهەمی ئەو زانایانە بە وردی موتالا بکات و بچێتە نێو دەریای قووڵ و فراوانیانەوە حا ئەوجار تێدەگات کە ئەو چ (رجل) ێکەو خەڵکیش چ جۆرە (رحال) ێک بووە !! بەڵام ئەوەی شارەزای بەرهەم و خەزێنەی دەوڵەمەندی زانایان نەبێ ڕەنگە زوو حۆی لێ بگۆڕێ و وابزانێ هیچ نەماوە نەیزانێ!!

## بەندی چوارەم
## مەزەبەکان ( المذاهب )

بەرلەوەی بێینە سەر خستنەرووی هەڵوێستمان دەربارەی مەزەبەکان پێشەکی وەک ڕێ خۆشکردن چەند خاڵێک سەبارەت بە مەسەلەی کۆشش کردن و هەڵهێنجان ( الاجتهاد والاستنباط) و چۆنیەتی پەیدابوونی شەرع ( فقه ) ی ئیسلامی و مەزەبەکان دەخەینەروو :

یەکەم: خوای زانا و کاربەجێ فەرموویەتی ( فاسالوا اهل الذکر ان کنتم لاتعلمون ) النحل / ٤٣ .

وە فەرموویەتی: ( واذا جاءهم امر من الامن او الخوف اذاعوا به ولو ردوه الی الرسول والی اولی الامر منهم لعلمه الذین یستنبطونه منهم .. ) النساء / ٨٣ .

وەک دەبینین لە دەق ( نص )ی

یەکەمیان دا فەرمانمان پێدەکات کە لەکاتی نەزانین دا پرسیار لەوانە بکەین کە خاوەنی زانیاری و شارەزایین کەواتە بابای مسوڵمان دەبێ هەوڵ بدات لە ئایینەکەی دا شارەزاو چاوساغ بێ، جا ئەگەر بۆی نەکرا ئەوەو شارەزاییو زانیاری یە وەدەست بێنێ ، ئەوە نابێ بە نەزانی هەنگاو بنێو پێویستە پرسیار لەوانە بکات کە زاناو شارەزان ، چونکە کوێرانە بەرێ دا ڕۆیشتن پیشەی ئینسانی عاقڵ نیە ، ( ولاتقف مالیس لک بە علم ... )

وە لە دەقی دووەمیش دا گلەیی لە کەسانێک دەکات کە لەکاتی بیستنی هەواڵێک دا یەکسەر بڵاوی دەکەنەوە ، بەرلەوەی بیگێڕنەوە بۆ لای پێغەمبەرو بو لای پێشەوایانیان ، ئەوانەی توانای هەڵهێنجان و ئەنجامگیری یان هەیە .

کەواتە بابای مسوڵمان پێویستە بۆ بڵاوکردنەوەو بڵاونەکردنەوەی هەواڵی

خۆش و ناخۆشیش خۆبەسەر نەبێ‌و پرس
بە زانایان بکات !

دووەم : هەروەها خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ( یا ایها الذین آمنوا اطیعوا اللە واطیعوا الرسول واولی الامر منکم فان تنازعتم فی شیء فردوه الی اللە والرسول ..)النساء /٥٩
لەم دەقەشدا خوای داگەر فەرمانمان پێدەکات کە فەرمانبەری وی و پێغەمبەرەکەی و پێشەوایانی خۆمان بکەین ، وە هەرکاتێک لە شتێک دا کەوتینە کێشەوە بیگێڕینەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی صلّی اللە علیه وسلم .
شایانی باسە کە ئەم ئایەتە بەپێزە هەموو ئەو بەڵگە شەرعیانەی کە بە سەرچاوەی هەڵهێنجرانی حوکمی شەرعی دادەنرێن و هەموو زانایان لەسەریان رێک کەوتوون ، گرتوونیە نێوخۆی ، کە

قورئان و سوننەت و ئیجماع و قیاسن .

چونکە ( اطیعوا الله واطیعوا الرسول ) وەک پێشتر گوتمان مەبەست پابەندبوونە بە قورئان و سوننەتەوە ، وە فەرمانبەری کردنی ( اولی الامر ) یش بەڵگەی ئیجماعە ، مەبەست لە (ردوه الى الله والرسول ) یش قیاس کردنە بۆسەر قورئان و سوننەت .

سێیەم : جارێکی کۆمەڵێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر رضی الله عنهم بە سەفەر چوون و یەکیان بەردێکی وەسەری کەوت ، سەری شکا ، دوایی لە خەوێ دا لەشی پیس بوو ، وە پرسیاری لە هاورێ یەکانی کرد کە ئایا پێتان وایە مۆڵەتی ( تەیەممومم ) کردنم بۆ هەبێ ، گوتیان نەخێر ، مادام ئاوت وەدەست بکەوێ ، ئنجا خۆی شردو لەئەنجامدا مرد ، کاتێک گەڕانەوە لای پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم و ئەو هەواڵەی

پێ درا فەرمووی :( قتلوه قتلهم الله الا سالوا اذا لم يعلموا فانما شفاء العی السؤال ..) رواه ابوداوود والدارقطنی وابن ماجه وصححه ابن السکن .

هەروەها کاتێک پێغەمبەری خوا ( معاذ بن جبل ) ی رەوانەی لای یەمەن کرد پێی فەرموو :

( کيف تقضی اذا عرض لک القضاء ؟ قال اقضی بکتاب الله ، قال فان لم يکن فی کتاب الله ؟ قال فبسنة رسول الله ، قال : فان لم يکن فی سنة رسول الله ؟ قال اجتهد رای ولا آلوا ، فضرب رسول الله صلی الله عليه وسلم علی صدره وقال : الحمد لله الذی وفق رسول رسول الله لما يرضی رسول الله ) اخرجه احمد وابوداوود والترمذی والدارمی والبيهقی وابن سعد .

وەک دەبینین پێغەمبەری خوا لە فەرموودەی یەکەمدا گلەیی لە کەسانێک

دەکات کە فتوای هەڵەیان داوەو پرسیان بە لەخۆیان زاناتر نەکردوە، وە لە دەقی دووەمیش دا ڕەزامەندی خۆی دەردەبڕێ لەسەر هەڵوێستی (معاذ) کە پێی فەرمووە: ئەگەر لە قورئان و سونندەت دا حوکمی شەرعیم دەست نەکەوت بۆخۆم کۆشش دەکەم و کەمتەرخەمی ناکەم.

چوارەم: پاش کۆچکردنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و ماڵئاوایی لە دنیا کردنی برادەرە بەڕێزەکانی خوا لێیان ڕازی بێ، بۆ چارەسەرکردنی هەر کێشەیەک و وەڵامی هەر پرسیارێک و هەر حوکمێکی شەرعی قورئان و سوننەت تاقە سەرچاوەی فتوا وەرگرتن و یاسا هەلهێنجانیان بوون، مەگەر مەسەلەیەکی وایان بۆ هاتبا پێش کە حوکمەکەی لە قورئان و سوننەت دا نەبایە، ئەوکاتە بۆخۆیان لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت دا دەستیان دەکرد بە

وردبوونەوەو ڕامان و کۆشش کردن و هەڵهێنجان .

هەڵبەتە گەلێک جاریش دەربارەی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەر پرسیاریان لە یەکتر دەکرد ، بو ئەو ڕووداوو مەسەلانەی کە دەهاتنە پێشیان .

( ابن جریر ) گوتوویەتی :

( عەبدوڵلای کوڕی عومەرو کۆمەڵێک لەو هاوەڵانەی پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم کە لەدوای وی لە مەدینەدا دەژیان ، بەگوێرەی مەزەبی ( زید بن ثابت ) فتوایان دەدا ، وە بەگوێرەی ئەو فەرموودانەی کە لەویان وەرگرتبوو نەیان توانیبوو لە پێغەمبەری خواوە وەریان بگرن و لەبەریان بکەن .

( مسروق ) لەوبارەوە فەرموویەتی :

( من گەورە گەورانی هاوەڵانی پێغەمبەرم دەدیتن کە لە بابەت میراتەوە پرسیاریان لە ( عائشە ) دەکرد ، وە جاری وابوو مەسەلەیەک بۆ ئەبووبەکری صیددیق

دەهاتە پێشێ خوا لێی ڕازی بێ، ئەویش بەپێی شارەزایی لە قورئان و سوننەتدا بڕیاری تێدا دەدا ، ئەگەر هیچی دەست نەکەوتبا لەو هاوەڵانەی دەپرسی کە لەلای بان ، جا ئەگەر زانیاری یەکی(١) لەوبارەوە دەستکەوتبایە وەری دەگرت دەنا بە بۆچوونی خۆی هەوڵی دەدا وەڵامێکی بۆ بدۆزێتەوە .

وە چوار خەلیفە بەڕێزەکان خوا لێیان ڕازی بێ زۆرجاران بۆ زۆر مەسەلان کە سەریان لێ دەرنەچووبان ، هاوەڵانیان خڕدەکردنەوەو کۆڕێکی ڕاوێژیان بۆ چارەسەری ئەو مەسەلانەو حوکمی شەرعیان پێک دێناو، لەبەر تیشکی ئەو وتوویژو دانیشتنەدا ئەو مەسەلانەیان چارە دەکردن .

---

(١) مەبەست لە زانیاری ( علم ) لێرەدا سوننەتە ، دەنا ئەگەر هەڵهێنجانی قورئانێ با بۆخۆی شارەزا بوو، بەلام سوننەتەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەنێو هاوەڵان دا بلاوبووبوونەوەو هیچ کامیان هەموویانی نەدەزانی .

وه ئەو هاوەڵانەی کە فتوایان لـێ وەرگیراوە لە (١٣٠) کەس پتر بوو ون لە پیاوو ژن .
بەڵام ئەوانەیان کە فتوایان زۆر بـووە ئەم حەوتەن ( عمر بن الخطاب ، علی بن ابی طالب ، عبدالله بن مسعود ، عائشه زید بن ثابت ، عبدالله بن عبـاس، وعبدالله بن زبیر ) [1] رضی الله عنهم .

پێنجەم : ئنجا پاش ( الفتوحـات الاسلامیه ) هاوەڵانی پێغەمبـەر خوا لێیان ڕازی بێ بە شارەکـان دا بڵاوبوونەوە ، بۆ ئەوەی ڕێڕوونی خەڵکی نوێ مسوڵمان بکەن و ئیسلامیـان تێ بگەیەنن ، وه شەش شار لـەو شوێنانەی کە ئەو بەڕێزانەی پێـدا بڵاوبوونەوە ، بوونە مەڵبەندی هاوەڵـە زاناکانی پێغەمبەر کە بریتیبوون لەمانە :

(١) بروانە (اعلام الموقعین عـن رب العالمین) ابن قیم الجوزیه .

( مەدینە ، مەککە ، کووفە ، بەسرە ، شام ، میصر ) .

جا لە هەرکام لەم شەش مەڵبەندانە ژمارەیەک لە هاوەڵە زاناکانی تێدا نیشتەجێ بوون و ، ئەو بەڕێزانەش هەر کامێکیان ژمارەیەک لە ( تابعین ) زانیاری یان لێ وەرگرتن ، هەروا بەم پێیە هەتا سەدەی دووەم و سێیەمی کۆچی کە مەزهەبەکانی تێدا دروست بوون .

لە شاری مەدینەدا ئەم بەڕێزانە ( عمر ، علی، عبدالله ابن مسعود ، زید بن ثابت ، عبدالله بن عباس ، عبدالله بن عمر ) ، وە غەیری وانیش زۆری دیکە هەبوون ، بەڵام ( عبدالله بن عمر و زید بن ثابت ) لە هەموویان پتر قوتابیان هەبوون .

لە شاری مەککەشدا ( معاذ بن جبل و عبدالله بن عباس ) ـ لە کۆتایی تەمەنیدا ـ نیشتەجێ بوون .

لە شاری کووفەشدا کۆمەڵێک لەو

بەڕێزانە نیشتەجێ بوون ، کـــــــە ناودارترینیان ( علی بن ابی طالـــب و عبدالله بن مسعود ) بوون .

شاری بەسرەش ( ابوموسی الاشعـــری و انس بن مالک ) ی تێدا نیشتەجـــێ بوو بوون .

شامیش عومەری کوڕی خەتتاب ( معاذو عبادە بن الصامت و ابوالدرداء ) ی بۆ ڕەوان کرد تا خەڵکەکەی تێ بگەیەنن .

میسریش زۆر لە هاوەڵان کۆچیان بـۆ کردبوو بەڵام ئەوەی کە لەوێ دا بە فتوا ناوی دەرکردبوو ( عبدالله بن عمـــرو وبن العاص ) بوو .

شەشەم : ئنجا لە هەرکام لەم بەڕێزانەوە ژمارەیەک لە ( تابعین ) فێـــری قورئان و سوننەت و کۆشش کـــــردن و هەڵهێنجانی حوکمو فتوا بوون ، وەک : ( سعید بن المسیب ، عروه بن الزبیـــر قاسم بن محمد ، خارجه بن زید ، سلیمـان

بن یسار، عبدالله بن عبدالله بن عتبه بن مسعود) لە مەدینە، وە (عطاء بن رباح، طاوس بن کیسان) لە مەککە، وە (علقمه بن قیس النخعی، شریح بن الحارث القاضی، عبدالله بن عتبه بن مسعود، اسود بن یزید، عمرو بن شرحبیل مسروق ابن الاجدع، عبدالرحمن بن ابی لیلی) لە کووفە، وە (حسن البصری، محمد ابن سیرین، مسلم بن یسار، شریح) لە بەسرە، وە (ابو ادریس الخولانی، شرحبیل ابن السمط، قبیصه بن ذویب الخزاعی) لە شام، وە (یزید بن حبیب، عبدالله ابن ابی جعفر) لە میسر.

ئنجا ئەو پێشەوا موجتەهیدانە پێگەیشتن کە هەرکامێکیان خاوەنی مەزەبێکی دیار بوو، کە ناودارترینیان ئەمانەن (سفیان الثوری، حسن البصری، ابن ابی لیلی، اوزاعی، لیث بن سعید، ابوحنیفه، مالک، شافعی

احمد ) خوا لە هەموو لایەکیان خۆش بێو پاداشتی بەرزو مەزنیان بداتەوەو ماڵیان ئاوابێ !(1)

وە شایانی باسە کە لەم (2) مەزەبانە بەس چوارەکەی دواییان ماونەوەو ئەوانی دیکە لەبەر چەند هۆیەک کە گرنگترینیان نەبوونی قوتابیانی مشوورخۆر بووبرانەوەو، چوار (3) مەزەبەکان جێی وانیشیان گرتەوە .

---

(1) بۆ نووسینی خاڵی چوارەم و پێنجەم و شەشەم پشتم بە کتێبی ( الائمە المجتهدون) بەستوە، نووسراوی : احمد عزالدین البیانونی لاپەڕە ( 10 تا 24 )
(2) شایانی باسە کە مەزەبی ( داود الظاهری ) کە ابن حزم دەمڕاستیەتی وەک چوار مەزەبەکان ماوەیەک لە ئارادابوو بەڵام پاشان ئەویش لەبەر چەند هۆیەک کە گرنگترینیان تەسکی ( حرفی) بوونی بوو نەما .
(3) ئەو چوار مەزەبە تایبەتن بە جەماوەری مسوڵمانانەوە کە بە ( اهل السنە والجماعە ) ناسراون ، دەنا شیعەکانیش مەزەبی جۆراوجۆریان هەبوو ون بەلاّم ئێستا بەس دووانیان ماون ،

جا خوێنەری بەڕێز !
بۆیە ئەم شەش خاڵانەم خستنەڕوو هەتا زۆرچاک، چۆنیەتی دەست پێکردنی کۆشش کردن و هەڵهێنجانمان لەبەرچاو بێ و مێژوو و چۆنیەتی مەزەبەکانیش ڕوون بێتەوە. ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە کە هەڵوێست و بیروبۆچوونی خۆمان دەربارەی مەسەلەی ئیجتیهاد و مەزەبەکان بخەینەڕوو.
بەلام پێشەکی ڕاو بیروبۆچوونی زانا و پێشەوایانمان لەوبارەوە دەخەمەڕوو، ئەوجار لە چەند خاڵێکی کورتدا هەڵوێستی خۆشمان، کە ئومێدەوارین لەوە بوەشێتەوە بە هەڵوێستی شوێن کەوتووانی ڕێبازی

---

..............................................
یەکەم کە ئی زۆربەیانە مەزەبی جەعفەری دوازدە ئیمامیە کە پێشەوایەکەی ئیمام جەعفەری صادیقە، دووەم مەزەبی زەیدی یە، کە پێشەوایەکەی زەیدی کوڕی عەلی( زین العابدین ) کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی یە .

پێغەمبەر لەقەڵەم بدرێ دەخەینەڕوو :

یەکەم: مەسەلەی کۆشش کـــــــــردن و هەڵهێنجان ( الاجتهاد والاستنباط)

لەبارەی کۆشش کردن و هەڵهێنجانەوە لەنێو زانایانی ڕابردوو و ئێستاش دا جیاوازی ڕاو مشتومڕێکی زۆر، لـە زۆر ڕووەوە هەیە، بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی بە مەبەستی ئێمەوە هەیە لێرەدا بـەس مەسەلەی داخران یان دانەخرانـــــــی دەرگای کۆشش کردن و هەڵهێنجانە .

بەشێک لە زانایان پێیان وایە کـە لەدوای سەدەی چوارەمی کۆچیەوە دەرگای ناوبراو گاڵەدراوەو هیچ کەسێکیـــــش پێی ناکرێتەوە (1)!

بەڵام بەشێکی دیکەیان کە ئەمانیـــش زۆربە ( اکثریە ) ن و کەڵە زانـــای زۆر

---

(1) بۆ وێنە بڕوانە فتوای شێخ محمـــد

بیرەزاو رۆچووشیان تێدا هەن[1]، دەڵێن: داخرانی دەرگای گۆڕین جگە لە ئەفسانە چیدی نیەو قسەیەکە ( ما انزل الله بها من سلطان ) ، چونکە ئەو دەرگایە خواو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە خەڵکیان کردۆتەوەو، هیچ کەسێکیش بۆی نیە لەخۆوە بڕیاری وان هەڵوەشێنێتەوە هەڵبەتە ئەوانەش کە دەعوای گالەدرانی دەرگای ناوبراو دەکەن نە لە قورئان و سوننەت و نە لە ئیجماع و نە لە قیاس دا

---

(1) بروانە ( ارشاد الفحول ... ) للشوکانی/ص ٢٢٤ ، وە بروانە ( تحفه المحتاج) ج١٠ ص ١٠٩. ابن حجر الهیتمی.

....................................

الحامد کە لەوبارەوە فەرموویەتی : ( والذی علینا علمه والعمل به، هو ما قرره فقهاونا رحمهم الله من ان الاجتهاد المطلق فی الاحکام ممنوع بعد ان مضت اربعمائة سنه من هجرة سیدنا مولانا محمد رسول الله ... لئلا یدعی الاجتهاد من لیس من اهله .. من اجل ذلک رای العلماء الاتقیاء اقفال هذا الباب ..) الائمه المجتهدون/ ص٩٢،٩٣ .

بەڵگەیان بەدەستەوە نیە بو ئیسپاتی دەعواکەیان. (١)

دووەم: مەسەلەی چوار مەزەبەکان (المذاهب الاربعه)

دیارە هەڵوێستی زانایان دەربارەی چوار مەزەبەکانیش هەر بەرهەمو ئەنجامی هەڵوێست و بۆچوونیانە دەربارەی مەسەلەی پێشوو، ئەوانەی کە بڕوایان بە داخرانی دەرگای کۆشش و هەڵهێنجان هەیە لەدوای سەدەی چوارەمەوە دەڵێن لەسەر هەر مسوڵمانێک فەرزە شوێن کەوتوو

---

(١) (اسنوی) لە شەرحی (منهاج الاصول) ی بیضاوی دا گوتوویەتی: (ان دعوی انقراض عصر الاجتهاد وانقضاء اهله لادلیل علیها من الکتاب والسنه ولا الاجتماع ولا القیاس فهی باطله) بڕوانە (آشنائی با تحولات مذاهب در اسلام) ص ١٠٩، محمد سعید ابراهیمی.

( مقلد ) ی یەکێک لەو چوار [1] مەزەبانە بێت ، بەڵام ئەوانی دیکە دەڵێن ئەوە مەرج نیە ، تەنانەت هەندێکیان هەن دەڵێن : ئەگەر کابرا نەشگەیبێتە پلەی کۆشش کردن هەر نابێ تەقلید بکات ، بەڵکو یان دەبێ بۆخۆی لێبکۆڵێتەوە ئەگەر توانای هەبێ، یان ئەگەر توانای توێژینەوەو بەدواداگەڕانی نەبێ [2] ، پرس بە زانایانی سەردەمی خۆی بکات .

ئەمە بەکورتی بیروڕاو هەڵوێستی زانایانە دەربارەی ئیجتیهادو تەقلید .

ئێمەش لەبەر تیشکی قورئان و سوننەتداو ، لەبەر تیشکی قسەی ئەو زانا بەڕێزانەدا ، هەڵوێستی خۆمان سەبارەت بە مەسەلەی ئیجتیهادو شوێن کەوتنی چوار مەزەبەکان لەم چەند خاڵەدا دەخەینەڕوو :

---

(١) بڕوانە (تحفە المحتاج) ج١٠ ص١٠٩ .
(٢) بڕوانە (ارشاد الفحول..) للشوکانی ص٢٣٦ . هەروەها سەرنجی (الوجیز) ی عبدالکریم زیدان بدە .

١- مادام هیچ حوکمێکی شەرعی بەبێ بەڵگە ( دلیل) ئیسپات ناکرێ و هیچ دەعوایەک بەبێ شایەد وەرناگیرێ ، مەسەلـــەی کۆتایی پێ هاتنی ئیجتیهادیش (١) هیچ بەڵگەیەکی متمانە پێکراوی لەسەر نیە کەواتە ناتوانین بڵێین :دەرگـــــای ئیجتیهاد داخراوە .

٢- ئەوەندەی کتێبی زانایانم موتـــالا کردوون ( لە بواری ( اصول الفقه ) دا بەس سێ قسەم هاتوونە بەرچاوان کـــە لایەنگرانی داخرانی دەرگای ئیجتیهـــاد بەئومێدی بەبەڵگە شیان کردبیانن :

آ- دەعوای ئیجماع کران لەسەر داخستنی دەرگای گۆرین !

ب- دەڵێن مەرجە دەبێ موجتەهیـــــدی موتڵەق هەروەک چۆن پێشـــــــــەوا

---

(١) مەبەست لە ( اجتهاد ) لێـــرەدا ئیجتیهادی موتڵەقە ، چونکە ئیجتیهاد لە چوارچێوەی مەزەبێکی دیاری کـراوو ئیجتیهاد لە مەسەلەیەکی تایبەتـــیدا بە ڕای هەموو زانایان هەر بەردەوامن .

سەرمەزەبەکان بنچینەکانی مەزەبەکانیان دارشتوون ، ئەویش یاساو بنچینەی دیکەی سەربەخۆ دابرێژێ ، دەنا بە موجتەهیدی موتلەق دانانرێ .

ج ـ دەلێن مەرجە دەبێ باوای موجتەهید بتوانێ لە هەموو مەسەلەیەک دا فتوا بدات !

بەلام ئێمە پێمان وایە هیچ کام لەم سێ قسانە ناکرێنە بەلگەی راستی دەعوای داخرانی دەرگای ناوبراو ،چونکە :

یەکەم : چۆن دەگونجێ دەعوای ئیجماع بکرێ لەحالێک دا کە چەندان کەسی وەک ( قفال، قاضی حسین ، سیوطی، ابن عبدالسلام ، ابن دقیق العید ، شوکانی، آمدی ، غزالی، اسنوی ..هتد ) بروایان بە داخرانی دەرگای گۆرین نەبووەو ، هەندێکیان (١) خۆشیان بە موجتەهیدی موتلەقو سەربەخۆ (مستقل ) ش زانیوە ؟!

---

(١) لەوانە ( سیوطیو شوکانی ) وە

دووەم: ناتوانین بڵێین چوار پێشەوا سەرمەزەبەکان یان غەیری وان بنچینەکانی کۆشش و هەڵهێنجانیان داڕشتوون، چونکە وەک پێشتر ڕوونمان کردەوە، پێغەمبەرو هاوەڵەکانیشی و شوێن کەوتووان (التابعین) یش، لەپێش پێشەوا سەرمەزەبەکان دا هەر لەسەر هەمان ڕچە ڕۆیشتوون و، ئەو بنچینانەیان هەر بەکارهێناون!

ئایا ئەوانیش – بەتایبەتی لەدوای پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم – هەر لەبەرتیشکی قورئان و سوننەت و ئیجماع و قیاس و باقی سەرچاوەکانی یاسادانان (مصادر التشريع) وەک

---

(ابن حجر) یش لە (تحفة المحتاج ج ١٠ ص ١٠٩) دەربارەی (قفال و قاضی حسین) گوتوویەتی (وكيف يمكن القضاء على الاعصار بخلوها عنه (يقصد المجتهد) والقفال نفسه كان يقول لسائله في مسائل الصبرة: تسالني عن مذهب الشافعي ام عما عندي، وقال هو وآخرون منهم تلميذه القاضي حسين: لسنا مقلدين للشافعي بل وافق راينا رايه ..).

( استصحاب وعرف والمصالح المرسلـه وشرع من قبلنا و .. هتد)دا فتوايان نه‌داوه؟ هه‌ڵبه‌ته ناونه‌هێنرانی ئـه‌م به‌ڵگه شه‌رعی‌یانه ( الادله الشرعیه ) ش ناکرێته به‌ڵگه‌ی کارپێنه‌کران و ڕه‌چاو نه‌کرانیان له‌پێش پێشـه‌وا سه‌رمه‌زه‌به‌کان دا، به‌تایبه‌تی لـه سه‌رده‌می عومه‌ری کوڕی خه‌تتاب دا، خوا لێی ڕازی بێ.

سێ یه‌م: مه‌رج نیه موجته‌هید وه‌ڵامـی هه‌موو پرسیارێک بزانێ‌و بتوانێ لـه هه‌موو بارێکه‌وه فتوا بدات، ئه‌وه‌تـا ئیمامی مالیک که یه‌کێک بووه لـه چوار پێشه‌وا سه‌رمه‌زه‌به‌کان، چل (٤٠) پرسیاری لێکراوه به‌س وه‌ڵامی چواریانـی داوه‌ته‌وه‌و، له وه‌ڵامی(٣٦) یـان دا فه‌رموویه‌تی: نازانم (لا ادری!)[1].

---

(١) بروانه (المستصفی من علم الاصول) للامام ابی حامد محمدالغزالـی ج٢ ص ٣٥٤.

ئنجا نەک هەر ئەو بەڵکو بەدەردی ئیمامی غەززالی فەرموویەتی: چەندان جار شافیعی، بگرە هاوەڵان ( اصحاب )یش لەئاقار زۆر مەسەلان دا دامـاون و بێ وەڵام بووون ![1]

ئنجا ڕای پەسندو بەهێز ( الـرای الراجح) لەلای تێکڕای زانایان ئەوەیە کە دروستە ( اجتهاد ) بەش بکرێ ، واتە دەگونجێ بابای موجتەهید لە هەندێک مەسەلەی تایبەتیدا بگاتە پلەی ئیجتیهادو ئیجتیهاد بکات ، بێ ئەوەی لە هەموو مەسەلەکانی شەرعدا گەیبێتە پلەی ناوبراو .[2]

---

(١) بروانە (المستصفى من علم الاصول ) للامام ابی حامد محمد الغزالـی ج٢ ص ٣٥٤ .

(٢) بروانە ( جمع الجوامع ) ج٢ ص ٣٨٦ . (والصحيح تجزی الاجتهاد )، هەروەها سەرنجی ( ارشاد الفحول .. ) بدە ص ٢٢٤ . ( غزالی ) یش گوتوویەتی: ( وليس الاجتهاد عندی منصبا لايتجزا بل يجـوز ان يقال للعالم بمنصب الاجتهاد فـی

٣- هیچ شتێکی ماقووڵ نیە ئینسان نە بۆخۆی بە ڕێیە بزانێ نە بەدوای شارەزایەک بکەوێ و هەروا گۆترەکاری و کوێرانە ملی ڕێیە بگرێ، کەواتە مەسەلەی شوێن کەوتن ( تقلید )ی یەکێک لەو مەزەبانەی کە لەنێو زانایان دا جێی ئیعتیبارن شتێکی پێویستە، بۆ هەرکەسێک کە نەگەیبێتە پلەی کۆشش کردن و هەڵهێنجان .

بەلاَم چەند ئاگاداری یەکی گرنگیشمان لەوبارەوە هەن :

یەک : چوار مەزەبەکان و غەیری وانیش بەس شەرح و لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی قورئان و سوننەتن ، کەواتە شەریعەتی

---

بعض الاحكام دون بعض ) ج٢ ص ٣٠٣ .
هەروەها خاوەنی (الوجیز فی اصول الفقه )
وە خاوەنی (فواتح الرحموت ) ج٢ ص ٣٦٤ ،
هەمان ڕایان هەیە .

ئیسلامی لە جوغزی چوار مەزەبەکان و غەیری وانیش دا کورت هەڵنەهاتوە، بەڵکو هەرکام لە چوار مەزەبەکان و غەیری وانیش جۆرێکە لە جۆرەکانی لێکدانەوەو شەرحی قورئان و سوننەت.

دوو: کەواتە شتێکی هەڵەو لەگەڵ عەقڵ و شەرعدا نەگونجاوە کە خۆشویستن و عاتیفەو دەمارگیری مەزەبی وامان لێبکات، ئیسلامی وا فراوان و پان وپۆڕ لە جوغزی هەر چوار مەزەبەکانیش دا ببینین چ جای یەکێکیان!

مادام وابێ! با ئاگادار بین و بەناوی (تەقلید) ەوە ئیسلام لە خەڵکی گچکە نەکەینەوەو ڕەحمەتی فراوانی خوایان لێ تەسک نەکەینەوەو، نە هەر چوار مەزەبەکان و نە هیچ کامیشیان لە خەڵکی نەکەینە (ئایین) و (ئیسلام) ێکی تایبەتی!

سێ: هەرچەندە زانایان ئاوا پێناسەی

( تقليد ) دەکەن :( اخذ القول بـــدون معرفه دليله ..) بەلاّم :

آ ـ سەرجەمی زانایان دەڵێن واچاکـــە بابای ( مقلد ) هەولّی زانینـــــــی بەڵگەی ڕاستی( فتوا ) یەکەی بـــــدات بەڵکو هەندێکیان پەی بردن بە بەڵگەی ڕاستی( ئیجتیهاد ) بەمەرجی تەقلیـــد دەزانن ![1]

ب ـ مەرج نیە مرۆڤ یان موجتەهید بـــێ یان شوێن کەوتوو( مقلد ) ، بەڵکـــو لەنێوان موجتەهیدو موقەللیددا پلەیەکی دیکە هەیە ، ئەویش ئی بابایەکە کـــە نەگەیوەتە پلەی ئیجتیهاد ، بەلاّم بـــە وەدواکەوتنی بێ ئاگایانەش قایل نیـــەو

---

(١) خاوەنی( جمع الحوامع ) دەربـــارەی تەقلید گوتوویەتی:(.. ویلزم غیـــر المجتهد وقیل بشرط تبین صحه اجتهاده وقیل لایقلد العالم وان لم یکن مجتهدا ) ج٢ ص ٣٩٣، هەروەها گوتوویەتی(وللعامی سواله عن ماخذه استرشادا ثم علیـــه بیانه ان لم یکن خفیا ) ج٢ ص ٣٩٧ .

بەڵکو وێڕای پابەندبوونی بە یەکێک لە مەزەبەکانەوە، بەردەوام هەوڵیش دەدات بەپێی توانا لێ بکۆڵێتەوەو لە هەر مەسەلەیەک دا بەڵگەی کام پێشەوا یان چ قسەو ڕایەکی پێ پتەوتر بێت هەڵی دەبژێرێ، هەڵبەتە ئەمەش نە (تلفیق) ەو نە بەدوای ئاسان دا گەڕان (تتبع الرخص) یشە، بەڵکو بەدوای ڕاستترو چاکتردا گەڕانە، [1] وەک خودا فەرموویەتی: (الذين يستمعون القول فيتبعون احسنه ..) الزمر/ ١٨.

چوار: هەرچەندە پێشەواو سەرمەزەبەکان خوا پلەیان بەرزتر بکاتەوە، هیچ درێغییان نەکردوە لە دۆزینەوەی هەق و ڕای ڕاست لە هەر مەسەلەیەک دا کە فەرموویانە، بەڵام ئەگەر هات و دوای لێکۆڵینەوەی وردو قووڵ بە بەڵگەی

---

(١) بڕوانە (جمع الجوامع) ج٢ ص ٤٠٠، ٤٠١، هەروەها سەرنجی (الوجيز) بدە، ص ٣١٦.

شەرعی پتەو دڵنیاو مسۆگەر بووین کە فلان پێشەوایە فلان فتوایەی پێچەوانەی فلان ئایەت و فەرموودە یان فلان بەڵگەیەو بەهەڵەدا چووە، یان قسەکەی بێ هێزەو لەئی وی چاکترو بەهێزترمان دەست کەوت، ئەوە پێویستە بێ سێودوو بچینە سەر ئەو ڕایەی کە بە هەق و ڕاست یان بە ڕاستتری دەزانین، (١) ئەمەش لادان نیە لە قسەی پێشەوایانمان، هەرچەندە لە حاڵێکی وادا پێویستیشە لابدەین چونکە ( لاطاعة لمخلوق فی معصیة الخالق ) ، بەڵکو ئەو ڕەفتارەمان جێبەجێکردنی فەرمانی ئەو پێشەوا بەڕێزانەیە چونکە فەرموویانە ( اذا صح الحدیث فهو مذهبی ) !!(٢)

---

(١) خاوەنی( العبادة فی الاسلام ) یش هەمان ڕای هەیە .

(٢) بروانە وتارەکەی ( شیخ محمد الحامد) لە کتێبی( الائمة المجتهدون ) دا ص ٩٢ .

بەلاّم گرنگ ئەوەیە ئاگاداری دوو شتان بین :

آ- بەناوی حەق دۆزینەوەو لێکوڵینەوەوە لەئاثار پێشەوایانمان دا تووشی بەدبینیو بێ ئەدەبی نەبین و خەڵکیش نەخەینە گێژی دوودڵیو گومانەوە لەبارەی پێشەوایانمان و مەزهەبەکانیانەوە .

ب- وەک چەند جاری دیکەش گوتوومە خۆمان و خەڵکیش بناسین و قسەی لەخۆمان گەورەتر نەکەین و ، لانی کەم موتالاّیەکی بەرهەمی زانایانمان بکەینو سەرەدەری یەک لە قورئان و سوننەت و ( اصول الفقه ) دا بکەین ، بەرلەوەی هیچ بیروڕایەکی تایبەتی دەربڕین !

## چەند پێناسەیەکی گرنگ

١- " القرآن "

قورئان ئەو کتێبەیە کە لەلایەن خواوە بۆ ( محمد ) پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم نێرراوەو لە ( مصحف ) ان دا نووسراوەتەوە بەشێوەی تەواتور بەئێمە گەیشتوە . (١)

٢- " السنە "

سوننەت ئەو قسەو کردەوەو دان پێداهینان ( تقریر ) انەن کە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیە وسلم بەئێمە گەیشتوە . (٢)

٣- " الفقە "

( فقە ) لە زاراوی شەرعدا یانی زانیاری هەبوون بەو یاسا شەرعیی کردەیی یانەی کە لەئەنجامی

---

(١)،(٢) بۆ نووسینی ئەم پێناسانە

کۆشش کردن دا پەیدابوو ون .(۱)

تێ بینی :

جیاوازی نێوان ( شەریعـــەت ) و ( شەرع ) لە دوو شتان دا کـــــورت دەکرێتەوە :

آ- شەریعەت بە دەقەکانی قورئـــان و سوننەت دەگوترێ کە لەرێ ی وەحـــی - یەوە بەئێمە گەیشتوە ، بەلاٚم شـــەرع بە قسەو فتوای زانایان دەگوتـــرێ و لەرێ ی کۆشش کردنەوە پەیدابـــووە ، هەرچەندە لە کتێبە شەرعی یەکان دا جگە لە شەرع شەریعەتیش خراوەتەروو ، چونکە شەرع بۆخوی شەرحی شەریعەتە !

---

.......................، (۱) سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتوە :
۱- ( الوجیز فی اصول الفقه )عبدالکریم زیدان ۲- ( المستصفی من علم الاصول ) الامام الغزالی ۳- ( تحفه المحتـاج ) ج۱ ص ۲۰ ابن حجر الهیتمی ۴- ( جمـع الجوامع ) تاج الدین ابن السبکـــی ۵- ( ارشاد الفحول ..) للشوکانـــی ۶- ( فواتح الرحموت بشرح مسلم الثبوت) عبدالعلی بن محمد نظام الدین الانصاری.

ب ـ شەرع تايبەتە بە ياســـــــا
كردەوەييەكان ( الاحكـــــــام
العملية ) ەوە ، بەلاّم شەريعەت سەرلەبەری
ياساكانی ئيسلام دەگرێتەوە .

٤ـ " الاجماع "

ئيجماع بريتيە لە يەكدەنـــــــگ
( متفق ) بوونی كۆشكەرانی ئوممەتـــی
ئيسلامی پاش مردنی پێغەمبەر ( محمـــد )
صلى الله عليه وسلم لە چاخێـــكدا
لەسەر هەر كارێك . (١)

٥ـ " القياس "

قياس بريتيە لە يەكسان كردنـــــی
مەسەلەيەك كە دەق لەسەر حوكمەكـــەی
نيە لەگەڵ مەسەلەيەكدا كە دەقـــی
لەسەرە لەبەر بەشداربوونی لە عيللەتی
حوكمی مەسەلە دەق لەسەر بووەكەدا . (٢)

٦ـ " الاجتهـاد "

بريتيە لە بەكارهێنانی ئەوپـــەڕی

---

(١) ، (٢) سەيری سەرچاوەی پێشوو بكە .

توانا لەلایەن موجتەهیدەوە بۆ وەدەست هێنانی زانیاری دەربارەی ئەو یاسا شەرعیيانەی کە دەقیان لەسەر نیە لە رێگەی هەڵهێنجانەوە.(١) ( کەواتە : موجتەهیدیش بابایەکە کە مەرجەکانی کۆشش کردن و هەڵهێنجانی تێدا هاتبنە دی ) .

٧- " التقلید "

تەقلید بریتیە لە وەرگرتنی قسەی موجتەهید بەبێ زانینی بەڵگەی قسەکەی، وە لەسەر غەیری موجتەهید پێویستە، هەندێکیش دەڵێن بەڵکو شارەزایی هەبوون بە راستیی بەڵگەکەی مەرجە،وە هەندێک گوتوویانە بابای زانا ئەگەر موجتەهیدیش نەبێ نابێ تەقلید بکات.(٢)

---

(١) سەیری سەرچاوەی پێشوو بکە .
(٢) ئەمە دەقی ( جمع الجوامع ) ە ج٢ ص ٣٩٢، ٣٩٣ .

## بەندی پێنجەم

## تەریقەت و تەصەووف

دەتوانین لەم چەند خاڵەدا هەڵوێست و بیروبۆچوونی خۆمان دەربارەی تەریقەت و صۆفیایەتی بخەینەڕوو :

یەکەم: ئێمە تەریقەت و تەصەووف ـ هەڵبەتە تەریقەت و تەصەووفی ڕاستەقینەو ساغ ـ بە بەشێکی گرنگ و بنەڕەتی ئیسلام دادەنێین ، بەڵکو دەتوانین بڵێین تەصەووفی ڕاستەقینە کاکڵی ئیسلام و ئامانجی نێرراوی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم چونکە ( طريقه ) یانی داب و دەستوور(١) ڕێ و شوێنێکی تایبەتی، کە لە زاراوی عیرفاندا مەبەست ڕێ و ڕەسمی پێغەمبەرە وە ( تصوف ) یش هەرچەندە زمانزانان

---

(١) بڕوانە ( لسان العرب ) ج١٠ ص ٢٢١.

کێشەی زۆریان لەسەر کردوە (١)، بەلام لە بەکارهێنانی ئەم وشەیەدا زەین بەلای خۆساف کردنەوەو بۆخوا ساغبوونەوەدا دەچێ، خۆ ئەگەر ئەمەش نەسەلمێنرێ ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە ئەهلی عیرفان و دڵ لەسەر ئەوە رێککەوتوون کە ئامانجی دوورو نیزیکی (تصوف) دوو شتە:

١- پاک بوونەوە (تخلیە) لە خوو و خدەو سیفەتە خراپەکان (الرذائل)

٢- رازانەوە (تحلیە) بە رەوشت و سیفەتە پەسندەکان (الفضائل).

وە (تصوف) ئامانجی نێررانی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم وەک فەرموویەتی: (هو الذی بعث فی الامیین رسولا منهم یتلو علیهم آیاته ویزکیهم ویعلمهم الکتاب والحکمە..) الجمعە/٢.

---

(١) بروانە (سیر عرفان در اسلام) د. زین الدین کیائی نژاد.

وشەی ( تزکیە ) شکە خوای میهرەبان لە سوورەتی( الشمس ) دا کردوویەتی بەهۆی سەرفرازی ( قد افلح من زکاها ) ئایەتی/٩ . هەم مانای ( تخلیە ) وە هەم مانای ( تحلیە ) شی تێدان ، چونکە وشەی ناوبراو مانای پاکبوونەوەو گەشەکردنیش دەگەیەنێ (١) !

دووەم: ڕەنگە یەکێک بپرسێ : چۆن دەڵێی ئێمە ( تصوف ) بە کاکڵی ئیسلامو ئامانجی نێرڕانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەزانین ، مەگەر نازانی کە ( تصوف ) بیدعەتێکە لەپاش سەردەمی پێغەمبەرو هاوەڵانی پەیدابووە ؟!

لەوەڵامدا دەڵێم :

ئەوکەسەی کە پێی وایە ( تصوف ) لەدوای چاخی پێغەمبەرو هاوەڵانیەوە داهێنراوە ، وادیارە کورت بینن و

---

(١) بروانە ( لسان العرب ) ابن منظور/ ج١٤ ص ٣٥٨ .

ڕواڵەت بینەو، بەس چاوی لەسەر وشەی ( تصوف ) چڕداگرتوەو، گوێ ی نەداوەتە مەعناو نێوەڕۆک ! بەواتایەکی دی، لەبەر توێڵک ئاگای لە کاکڵ نەماوە !

وای زانیوە هەروەک چۆن وشەی (تصوف ) وەک زاراوەیەکی تایبەتی دوای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و هاوەڵانی، خوا لێیان ڕازی بێ پەیدابووە، ئەو حەقیقەت و نێوەڕۆکەش کە ناوی گۆڕین دەلالەتی لەسەر دەکات هەروایە، بەڵام نەخێر حەقیقەت و کاکڵی ( تصوف ) کە لە دوو شتان دا کورت دەکرێتەوە :

١- شوێن کەوتن ( اتباع ) ی مووبەمووی ڕێ و شوێنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەتایبەتی لەبواری خواپەرستیو خوو و ڕەوشت دا .

٢- ساغبوونەوە ( اخلاص )و یەکلابوونەوەی تەواو بۆ خوا .

بەڵێ ئەم حەقیقەتە شتێک بووە کە لە یەکەمین ڕۆژی هاتنی ئیسلامەوە

هەبووەو، هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەریش هەر لەسەر ئەو پەیڕەوو ڕێ و شوێنە بوو ون . ئنجا هەروەک چۆن ناوی ( تصوف ) پاشان وەک زاراوەیەکی تایبەتی داهێنرا هەرکام لە زاراوی ( فقه ) و ( تجوید ) و ( اصول فقه ) و ( علوم القرآن ) و ( علوم الحدیث ) و ( علم الکلام ) و .. هتدیش بەهەمان شێوە، دەجا هیچ کەسیش ناتوانێ بڵێ ئەمانە بەشێک نین لە ئیسلام !

سێیەم: بەڵێ ئێمە ( تصوف ) بە بەشێکی هەرەگرنگ و بنەڕەتی ئیسلام لەقەڵەم دەدەین ، وە بە پێچەوانەی لێحاڵیبوونی کەسانێکی لاساکەرەوەو ڕواڵەتبین و بێ دڵ ( عدیم القلب ) ەوە، ئێمە ئەو شێوە ڕەوشت و ئاکارەی کە ڕابەرانی لێهاتوو و ڕۆچووی ( تصوف )فەرموویانەو ڕەفتاریان پێکردوەو، ئەو خەزێنەو کەلەپوورە پڕ گەوهەرو مرواریەی

ناودارانی جیهانی عیرفان و تەصەووف بۆیان بەجێ هێشتووین ، بە بەشێکی ڕەسەن و گرنگی ئیسلامی دەزانین و پێمان وایە تایبەت نەبێ بە کەسانێکەوە کە ئەمڕۆ خۆیان بە ( صۆفی) دەزانن و ، بەڵام زۆربەیان لەو ناو لەخۆنانەیاندا یان بەهەڵەدا چوون و نازانن ، یان درۆدەکەن و فێڵبازو زۆرزانن !

بەڵێ ئێمە هەروەک چۆن ناتوانین بڵێین بێ ئیحتیاج ( مستغن ) ین لە بەرهەمو کەلەپووری شەرعزانان ( فقهاء ) و توێژەرەوان ( مفسرین ) و فەرموودەناسان ( محدثین ) و قسەبێژان ( متکلمین ) و بنچینەناسان ( اصولیین ) و مێژووناسان ( مؤرخین ) و .. هتد بەهەمان شێوەش ئەگەر بەچاکی لە حەقیقەت و کاکڵی تەریقەت و تەصەووف تێبگەین و ، عاقڵانە موتالای ئەو خەزێنە دەوڵەمەندە پڕ ( أسرارو أنوار ) ە بکەین کە بەرهەمی

هێنا وە ، دەزانین کە بەهیچ شێوەیەک ناگونجێ دەست بەرداری بین .

چوارەم : ئنجا ئەگەر یەکێک بڵێ : ئێمە مادام قورئان و سوننەتمان لەبەردەستدا بن چ حەوجێی بەرھەمو کەلەپووری ( تصوف ) ین ؟!

لەوەڵامیدا دەڵێین :

ئەم پرسیارە بەس ڕووناکاتە بەرهەمی ( تصوف ) ، بەڵکو ئەگەر بەو پێیە بجووڵێینەوە ، هەرکام لە ( فقه ) و ( تفسیر ) و ( شروح السنه ) و ( اصول الفقه ) و ( علم الکلام ) و .. هتد دەکەونە بەر مەترسی ئەو پێویست پێ نەبوونە ، بەڵام نەخێر ئێمە ناتوانین دەست بەرداری هیچ کام لە ( فقهو تفسیرو شروح السنەو اصول الفقهو علم الکلامو .. هتد ) بین چونکە وەک لە بەندەکانی پێشوودا گوتمان قورئانو سوننەت هەموو شتێکیان بەدرێژی تێدا نیەو زۆر شتیان هەر بە ئیشارەو ڕەمزە

بەڵکو زۆر مەسەلە هەن بە ئیشارەو
ڕەمزیش هەر باس نەکراون ، کەواتە
ناچارین پەنا بەرینە بەر کۆشش کردن و
هەڵهێنجان دیارە ئەمیش بابای خۆی
دەوێ و پارووی هەموو کەس نیە ، دەجا
هەروەک چۆن ناتوانین دەست بەرداری
( فقه ) بین چونکە زانیاری ناوبراو
شەرحو لێکدانەوەو توێژینەوەی ئەو
دەقانەیە کە یاساکان ( الاحکام ) یان
تێدان ، بەهەمان شێوەش ناکرێ واز لە
بەرهەمی ( تصوف ) بێنین چونکە ئەمیش
شەرحو لێکدانەوەی کردەیی ( عملی )
یاساکانی شەرعو ئەو ئەدەبو
دەستوورانەیە کە پەیوەندی یان بە
لایەنی مەعنەوی و پەنهانی قورئان و
سوننەتەوە هەیە . بۆ نموونە :
بەچاوی عەقڵ و دڵ موتالای ئەو شێوازو
چۆنیەتیە بکە کە ئیمامی غەززالی
بۆ چۆنیەتی بەجێهێنانی نوێژو ڕۆژوو و
زەکات و حەجو قورئان خوێندن و زیکر

کردن لە کتێبی( احیاء علوم الدین )
یان ( کیمیای سعادت ) دا فەرموویەتی؛
تاکو ڕاستیی ئەم قسەیەم بسەلمێنی .
پێنجەم: وە پتەوترین بەڵگەم- ویڕای
ئەوەی باسکرا - بۆ سەلماندنی
ڕەسەنایەتی( اصالە ) ی و گرنگی و
بایەخی( تصوف ) ئەوەیە کە ئەوەندەی
لە ڕێبازی ناوبراوەوە تێگەیشتوو و
پێگەیشتووانی ناودار خەڵیون ، وە
ئەوەندەی لەبن ئاڵاو درووشمی ڕێبازی
ناوبراودا ئیسلام بلاوکراوەتەوەو بە
شوێنە دوورەکان گەیەندراوەو، ئەوەندەی
مەردانی ئەو ڕێبازە خەڵکیان بۆ چاک
کراوەو بەرەوخوا هێناوەو .. هتد لە
هیچ ڕێبازێکی دیکەدا ئەم دیاردەیە
نابینرێ .

بەڵام نابێ لەم ڕاستیيانەش بێئاگا
بین :
١- ئێمە لێرەدا کە مەدحی ( تصوف )
دەکەین مەبەستمان لەو ( تصوف ) ە

ڕاستەقینەیە کە مەردانی وەک جونەیدو گەیلانیو غەززالیو مەعرووفی کەرخی و ئیمامی ڕەببانیو مەولانای ڕۆمی و بهاء الدین نقشبندو شەعرانیو .. هتد بەڕێوەیان دەبرد، نەک ئەوەی ئێستا .

٢- تەصەووف بەشێکە لە ئیسلام، نەک جۆرە ئیسلامێکی تایبەتی، وە تەریقەت یانی چاک بەڕێوەبردنی شەریعەتی ئیسلام بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی خواناسی، کەواتە هەرکاتێک لە شیرازەی شەرع ترازا (حماقة)ە نەک تەریقەت .

٣- هەموو ئەو زرە شێخە دڵنەخۆشانەی لەبن پەردەی تەریقەت و تەصەوف دا زاڵمپەرستی یان دنیاپەرستی دەکەنە پیشە، دەبێ بە دوژمن و ناحەزی تەریقەت و تەصەووف دابنرێن، نەک بەهۆی وانەوە تەریقەتمان لەبەرچاو بکەوێ .

٤- پێویستە هەموو مسوڵمانێک پشک و بەشی لە تەصەووفدا هەبێ، بەڵام بەتەنێ بە تەصەووف نابینە مسوڵمانێکی

ئیسلامی موحەممەدی یانە ، چونکە پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم ویڕای لایەنی( تصوف ) لایەنەکانی دیکەی ئیسلامیشی تێدا بوو ون .

٥- کەسانێکی وەک پێنج پێشەوا سەرمەزەبەکان ( ابوحنیفە ، مالک احمد ، شافعی، جعفر الصادق ) وە ابن عبدالسلام وابن الصلاح الشهرزوری و ابن تیمیەو ابن قیمو ابن حجرالهیتمی وابن حجر العسقلانی وسیوطی‌و شوکانی و حسن البناو نورسی‌و .. هتد هەرچەندە ناوی تەریقەت و سۆفیایەتی‌یان بەسەردا نەبڕاوە بەلاّم گەورەترین پشکیان لە حەقیقەتی( تصوف ) دا هەبووە ، دیسان زوربەی هەرەزۆری ناودارو پێشەوایانی ( تصوف ) ماموّستاو زانای زۆر بەرز بوو ون ، کەواتە زانای ڕاستەقینە ئەوەیە کە هەم( فقه الظاهر) و هەم ( فقه الباطن ) ی هەبێ .(١)

---

(١) مەبەستم لە ( فقه الظاهر ) ئەو

٦- ئاشكرایە کە بە درێژایی مێژوو لەبن پەردەی تەصەووفدا بیدعەت و ئەفسانەی زۆر بڵاوکراونەوەو، شێوە ژیان و ڕەفتاری بێ مەعناو سەیرو سەمەرەی بێ شەرعییانەو، قسەو دەربڕینی دوور لە هەق و بێجێو ناماقووڵ ڕەواجیان پێ دراوەو، لەسۆنگەی ئەوەشەوە زۆر نەخۆشی فیکری و کۆمەلایەتیو سیاسی لەنێو ئوممەتی ئیسلامیدا بڵاوبوونەوە، وەک:

١- شەخس پەرستیو داروبەرد پەرستی.

---

................................
یاسایانەی ئیسلامن کە پەیوەندییان بە ئەندامەکانی مرۆڤ و دیوی دەرەوەیەوە هەیە، وەک چۆنیەتی نوێژو دەستنوێژو ڕۆژووگرتن و قورئان خوێندن و جیهادکردن و هتد، وە مەبەستم لە (فقه الباطن) ئەو یاساو دەستوورانەی ئیسلامن کە باسی دیوی پەنهان و نێوەوەی مرۆڤ دەکەن، وەک چۆنیەتی پەیداکردنی (أخلاص و توکل و تواضع) و لابردنی (شرک و ریا و کبرو عجب و حسد) ...

٢- بیدعەت سازی و ئەفسانەبازی .
٣- واز لەدنیاهێنان و دەست وەبن سەری دان و هەڵخزان .
٤- ساردبوونەوە لە کردوکۆش و جیهادو هەوڵ دان و، بەتەمای خواو شێخ لێ گەڕان .
٥- بە تۆڵک و ڕواڵەت لەقەڵەمدانی شەریعەت کە قورئان و سوننەتن !!
بێ ئاگا لەوەی کە تەریقەتی ڕاست بەس جێبەجێکردن و ئیش پێکردنی شەریعەتی پێغەمبەرەو هیچی دی !
بەڵام بێگومان شتێک کە لە ئەسڵ دا چاک بێ، بەهۆی لادرانیو خراپ بەکارهێنرانیەوە خراپ نابێو نابێ لەبەرچاومان بکەوێ .

٧- پێویستە لەکاتی موتالاو خوێندنەوەو سوودلێوەرگرتنی کتێب و بەرهەمەکانی تەصەووفدا زۆر وردو وریاو بێداربینو هەردەم تەرازووی قورئان و سوننەتمان

بەدەستەوەبێ، چونکە وەک پێشتر گوتمان
جگە لە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم
هیچ کەس پارێزراو ( معصوم ) نیە ، ئنجا
زۆر جاران لە قسەو بەرهەمی ڕابـــەرو
پێشەوایانی تەصەووفیش دا چ جـــــای
عەوامو ڕەشوکییەکان شتی هەڵەو لەگەڵ
ڕووحی ئیسلامدا نەگونجاو دەبینــــرێ ،
تەنانەت کەلەزاناو دانایەکـــی وەک
( غزّالی ) یش ( احیاء علـــــوم
الدین ) ەکەی لەگەڵ گەورەیــــی دا
خـڵتەشی هەیە .

بەندی شەشەم

## کۆمەڵ و بزووتنەوەکان
## (الجماعات والحركات)

خوا پشتیوان بێ هەڵوێستی خۆمان وەک شوێن کەوتووانی ڕێبازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە چەند خاڵێکی کورت و گوشراودا لەبارەی کۆمەڵ و بزووتنەوەکانی ئەم ڕۆژگارە دەخەینەڕوو، ئنجا ئەو کۆمەڵ و جمو جۆڵانە لە جیهاندا بەگشتیو لە دەوروبەرماندا بەتایبەتی دوو جۆرن، جۆرێکیان خۆیان بە ئیسلامی لەقەڵەم دەدەن، جۆرێکیشیان بە نائیسلامی، کەواتە با جارێ هەڵوێستمان سەبارەت بە جۆری یەکەمیان بخەینەڕوو :

١- کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامی یەکان :

یەک : ئێمە هەموو ئەو کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامیيانەی کە بەدرێژایی مێژووی ئیسلام لە جیهانی ئیسلامیدا

سەریان هەڵداوە، بە مەبەستی نوێ کردنەوەی ڕێبازی پێغەمبەرو صلی اللە علیە وسلم بووژاندنەوەی ئیسلام، جێی ئەوپەڕی ڕێزو حورمەت و سوپاسکردنمانن وە بەپێی تواناش لەخزمەتیان داین، بەڵام ئەو ڕێزگرتن و سوپاسکردن و خزمەتکردنە بە ئەندازەی ڕاستی و نیزیکی‌یانە لە ئیسلامەوەو پابەندی یانە بە قورئان و سوننەتەوە، وە ئێمە ئەو کۆمەڵ و جووڵانەوانە بەو کۆمەڵ (طائفە) ە لەقەڵەم دەدەین کە پێغەمبەری خوا هەواڵ و مزگێنی لەسەر داوە کە هەتا کۆتایی دنیا، کۆمەڵە مسوڵمانێکی تێکۆشەرو جەنگاوەری ڕاست هەر دەمێنن، بۆ ڕاست ڕاگەیاندن و چاک بەڕێوەبردنی بەرنامەی خوا. (١)

دوو : بەڵام بەپێچەوانەوە هەموو کۆمەڵو جموجۆڵە بەناوئیسلامی‌یەکانی کە لەبن

---

(١) ( لاتزال طائفة من امتي ظاهرين حتى

پەردەی ئیسلامدا لەلایەن دوژمـــــن و ناحەزانی فێڵبازەوە بەدرێژایی مێژوو دروستکراون و ئێستاش بەردەوام دروست دەکرێن ، بۆ زیان لە ئیســـلام دان و ناشیرین کردن و لەبەرچاو بێزاندنـی ، یان بۆ دابین کردنی هەندێک بەرژەوەندی سیاسی دنیاییو شەخسی، ئەوە ئێمـــــە هەموو ئەوانە بە ( مساجد ضــــرار ) لەقەڵەم دەدەین و ، هێندەی هەموو دنیا رقمان لێیانەو بەپێی تواناش ئەگـــەر هەوڵی لەنێوبردنیشیان نەدەیـــــن - لەبەر نەکران - هەوڵ دەدەیــــن دەمامکی فێڵبازانەی سەر روویــــان

...................................
یاتیهم امر الله وهم ظاهرون ) متفـــق علیه / ( فیض القدیر )، ج٦ ص ٣٩٥، ژمـاره (٩٧٧٠) . هەروەها فەرموویەتی: ( لــن یبرح هذا الدین قائما یقاتل علیـــه عصابة من المسلمین حتی تقوم الساعه ) رواه مسلم / (فیض القدیر ) ج٥ ص ٣٠١ ، ژماره (٧٣٨٦) .

لابدەین و بە خەڵکیان بناسێنیـــــــن و
ناویان بزڕێنین ، تاکو خەڵکی عـــەوام و
سادە پێیان هەڵنەفریوێ و تووشی تەڵەو
داویان نەبێ .
سێ : بەڵام ئێمە جگە لە قورئـــــان و
سوننەت هیچ شتێکی دیکە بـــــــە
بەرنامەو پەیڕەوی خۆمان لەقەڵـــــەم
نادەین و ، هەموو ئەو کتێب و نووسراو و
بەرهەمانەش کە ئەو کۆمەڵ و بزووتنەوانە
بەرهەمیان هێناون ، بە خەزێنـــــەو
کەلەپووری مێژووی ئیسلامی لەقەڵـــــەم
دەدەین و ، لەبەر تیشکی قورئـــــان و
سوننەتدا سەرنجیان دەدەین و بـــــە
ئەندازەی ڕەسەن بوون ( اصالە ) یـــان
گرنگیان پێدەدەین و بەهرەیـــــــان
لێ وەردەگرین .
چوار : ئێمە هەرکام لەو کۆمـــــەڵ و
بزووتنەوانە کە گوتم جێی ڕێزمانـــن ،
بە تەجروبەیەکی مێژووی ئیسـلام
دادەنێین کە مسوڵمانان لە گەرمـــەی

سەرگەرمیيان بە هەولدانەوە بۆ
بووژاندنەوەی ئیسلام پێیان هەستاون
وە هەوڵ دەدەین سوود لە هەڵوێستە
ڕاست و تەواوەکانیان وەربگرین و
پەندیش لە هەڵوێستە هەڵەو
ناتەواوەکانیان وەربگرین .
پێنج: وەک گوتمان ئێمە ئەو جموجۆڵانە
بە چەند تەجروبەیەکی مێژووی ئیسلام
دەزانین ، کەواتە پێمان ڕاست نیە
هیچ کام لەو هەوڵ ( محاولـه ) و
ئەزموونانە دووبارە بکەینەوە ، بەڵکو
پێویستە سوودو پەندیان لێ وەربگرین و
ئێمەش بۆخۆمان بە بیرکردنەوەو
لێکدانەوەی خۆمان و لەبەر تیشکی
قورئان و سوننەت و کەلەپووری ڕەسەنی
ئیسلامیدا ، هەولی خۆمان بدەین و
تەجرووبەی تایبەتی خۆمان بۆ نوێ
کردنەوەی خەت و ڕێبازی پێغەمبەر صلى
الله عليه وسلم بخەینەروو .
چونکە هەرکام لەو کۆمەڵ و

جوولاَنەوانە لە بارودۆخێکی دیکەی جیا لەوەی ئێمەدا و، بۆ چارەسەرکردنی واقیعێکی جوێ لە واقیعی ئێمە پەیدا بوون، هەرکەسێکیش لەخۆی نەگۆڕێ و، لغاوی لاساکردنەوەو دەمارگیری (تعصب)ی ئیشکی حیزبی‌یانەی هێندە لە گەردنی توند نەبووبێ کە ڕێی بیرکردنەوەی لێ بگرێ، ئەوەی گوتم دەسەلمێنێ.

ئنجا بێینە سەر جۆری دووەم:

٢- کۆمەڵ و جموجۆڵە نائیسلامی یەکان:

یەک: ئێمە دڵنیاو مسۆگەرین کە گەورەترین هۆ کە بۆتە هاندەری دروست بوون و سەرهەڵدانی ئەو پێڕو تاقمەو ڕێچکەو بیردوزانە لەنێو ئۆمەتی ئیسلامی‌دا، هەبوونی ستەم و چەوساندنەوەو چینایەتی‌و خراپەو بێ سەرەوبەرەیی بووە بەهۆی لەگۆڕێ دا نەبوونی حوکمی ئیسلامی ڕاستەقینە.

دوو: وە دڵنیاشین کە ئەوەی وای لە خەڵکی مسوڵمان کرد ناچاربێ بۆ

چارەی دەردی خۆی پەنا بەرێتە بەر ئەو رێچکەو بیردۆزانە، نەبوونی تێگەیشتنێکی ڕاست بووە سەبارەت بە ئیسلام ( عدم وجود فهم صحیح للاسلام ) ، ویرای لە مەیدان دا نەبوونی ڕابەرو چاوساغو مشوورخۆرانی ئیسلام !
دەنا کابرا هەتا شتێک لە مالێ خۆی شک بەرێ بۆی ناچێتە مالێ دراوسێ ی ، وە هەرکەسێک تیشکی رۆژی ڕوونی لێ دیاربێ، ناچێ لەبەر شۆقی چرا رەشکەیەک دانیشێ .
سێ: وە ئێمە جگە لە ئیسلام هەموو بەرنامەو پەیرەوێکی دیکەو، جگە لە خەت و رێبازی موحەممەد هەموو رێچکەو کوێرە ڕێ یەک بە هەڵەو خوارو خێچ دەزانین و، بڕواشمان وایە کە جگە لە بەرنامەو پەیرەوی خواو، جگە لە خەتی پێغەمبەری پێشەوا ، صلی اللە علیە وسلم هیچ بەرنامەو خەتێکی دیکە نەک هەر خەلکی بەمراد ناگەیەنێ و

ناحەسێنێتەوە، بگرە بنەتۆویش ناکەنەوەو شوێن کەوتوویان شوێنکەوتووی کلاوی خوارەو، هەر ساڵە خۆزگەی بەپارەو لەسەر سوێ ی هەڵدێری هەزار بە هەزارە !!
چوار: ئنجا بەپێی فەرمانی خوا کە دەفەرموێ :( ورضیت لکم الاسلام دینا ) المائدە/ ٣ . واتە: وە ئیسلامم بو بە بەرنامە پەسندکردوون، وە کە دەفەرموێ :( ومن یبتغ غیر الاسلام دینا فلن یقبل منه وهو فی الاخرة من الخاسرین ) آل عمران / ٨٥ . واتە : وە هەرکەسێک جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ ئەوە لێی وەرناگیرێ و لە دواڕۆژیشدا لە زیانبارانە، وە کە دەفەرموێ :( افحکم الجاهلیه یبغون ومن احسن من الله حکما لقوم یوقنون ) المائدە/ ٥٠ . وە کە دەفەرموێ :( فلا وربک لایؤمنون حتی یُحکّموک فیما شجر بینهم ثم لایجدوا فی

انفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليما ) النساء / ٦٥ .
بەڵێ بەپێی ئەم دەقانەو چەندان دەقی دیکەی قورئان و سوننەت ، بە ڕاشکاوی دەڵێین :
هیچ کەسێک - مادام خۆی بە مسوڵمان و ئۆممەتی موحەممەد صلی الله علیه وسلم بزانێ - بۆی نیە جگە لە ئیسلام وەدوای هیچ ئایین و بەرنامەیەکی دیکە بکەوێ ، نە لەبواری فیکری و مەعنەوی دا ، نە سیاسی ، نە کۆمەلایەتی ، نە ئابووری ، نە ..هتددا
بەڵێ مسوڵمان دەبێ لە هەموو شتێکی‌داو لە هەموو بوارو لایەنێکی ژیانی‌دا تەنیاو تەنیا ( ئیسلامی ) بێ‌و هیچی دی ، نە ڕۆژهەلاتی‌و نە ڕۆژئاوایی نە چەپ‌و نە ڕاست ، بەڵکو ڕاستەخەت ( صراط مستقیم ) .
بە ئاشکراترو بێ پەردەتر دەڵێم :
خوا فەرموویەتی: ( وان هذا صراطی

مستقيما فاتبعوه ولاتتبعوا السبل متفرق بكم عن سبيله ..) الانعام/١٥٣ .

واته: وه ئه‌مه ڕاسته‌ڕێی منه شوێنی بکه‌ون و وه‌دوای ڕێچکان مه‌که‌ون ده‌نا له ڕێی وی ده‌ترازێن و په‌رته‌وازه ده‌بن .

که‌واته کاکڵه‌ی مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه که مرۆڤی مسوڵمان ده‌بێ مسوڵمانێکی (١) ئیسلامی بێ، نه دیموکراتی بێ، نه مارکسی، نه سۆسیالیست ، نه ناسیۆنالیست ، نه کاپیتالیست و ..نه هیچ شتێکی دیکه‌ی له‌م بابه‌تانه .

(١) له به‌ندی حه‌وته‌مدا حوکمی ئه‌و که‌سانه ده‌خه‌ینه‌ڕوو ، که وه‌دوای غه‌یری ئیسلام.ده‌که‌ون .

## بەندی حەوتەم

## ئەهلی قیبلە ( ئۆممەتی موحەممەد )

پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم لەسۆنگەی ئەوەوە کە دەقێکی بێ پێچوپەنا ( نص صریح )[1] نە لە قورئان و نە لە سوننەتدا لەسەر دیاری کردنی جێنشینێکی تایبەتی بۆ پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام لەبەردەستی هاوەڵە بەرێزەکان ( الاصحاب الکرام ) دا نەبوو، خوا لێیان رازی بێ

---

(١) ئەمە رای جەماوەری مسوڵمانانە کە بە ( اهل السنە والجماعە ) ناسراون ، قسەی ( شیعە ) کانیش کە دەڵێن دەق هەیە لەسەر دانرانی ( علی ) بە خەلیفە لەدوای پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم ، قسەیەکی بێ بنچینەو بێ پشتیوانەو ، لەلایەن زاناو پێشەوایانی ( اهل السنە ) وە چاک بەرپەرچ دراوەتەوە ، بۆ وێنە سەرنجی ( التفسیر الکبیر ) و ( منهاج السنة النبویە ) و ( التحفة الاثنا عشریە ) بدە !

مسولْمانان لەبارەی دیاری کردنی خەلیفەوە کەوتنە کێشمەکێش و مشت و مڕەوەو بیرورای جیاجیایان دەربرین ، بەلاَم سەرەنجام هاتنەسەر ئەوەی کە ( ابوبکر الصدیق ) خوا لێی ڕازی بێ بە یەکەمین جێنشینی پێغەمبەر هەلبژێرن .

ئنجا پاش هەلبژێررانی ( ابوبکر ) ، مسولْمانان هیچ گیروگرفتێکیان لەوبارەوە نەهاتەوەڕێ ، هەتا نیوەی دووەمی سەردەمی خەلافەتی ( عثمان ) خوا لێی ڕازی بێ ، کە بەهۆی چەند شتێکەوە کە هەندێکیان دەگەڕانەوە بۆ خودی ( عثمان ) و هەندێکیشیان ، بەلْکو گرنگترینیان دەگەڕانەوە بۆ دەستی پیسی پەنهانی دوژمن و ناحەزانی فێلْبازی ئیسلام ، چەند کێشەو ناکۆکی‌یەک پەیدابوون ، کە سەریان کێشا بۆ شەهیدکرانی خەلیفەی سێیەم خوا لێی ڕازی بێ .

ئنجا لێرەوە ـ واتە لەپاش شەهیدکرانی خەلیفەی سێیەم ـ تۆوی شەڕو هەراو دووبەرەکیو یەکدی بوغزاندن و لەیەک خوێندن بە زەوی دڵی مسوڵمانان وەربوو و، سەرەنجام دوای هەڵبژێررانی( علی) خوا لێی ڕازی بێ بە چوارەمین خەلیفەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، سێ جەنگی گەورەو ماڵ ویرانکەر لەنێوان خەلیفەو سێ جۆر لە یاخی بووان ( بغاة ) ەوە ڕوویان دا یەکەمیان جەنگی( جمل ) کە سوپای نەیارانی خەلیفە بە سەرکردایەتی ( عائشەو طلحەو زبیر ) بوو خوا لێیان ڕازی بێ، دووەم جەنگی( صفین ) کە ( معاویە ) و دارودەستەکەی بەرپایان کرد، سێیەم جەنگی( نهروان ) کە لەنێوان خەلیفەو ئەو کۆمەڵەدا ڕووی دا کە پاش ڕازی بوونی ناچاری و نابەدڵی خەلیفە بە مەسەلەی قورئان کردنە حەکەم ( تحکیم ) لێی جوێ بوونەوەو بە ( خوارج ) ناسران .

بەڵێ دوای ڕوودانی ئەو سێ جەنگە بێرەزایە لەنێوان خەلیفەی چوارەم و بەڵێن شکێنان ( ناکثین ) و ستەمکاران ( قاسطین ) و لەڕێ دەرچووان (خوارج)دا لە بەرانبەر خەت و ڕێبازی پێغەمبەر و چوار جێنشینە سەر ڕاست و ڕێرووونی کراوەکان ( الخلفاء الاربعه الراشدون المهدیون ) دا کە پاشان بە ڕێبازی ( اهل السنه والجماعه ) شۆرەتی پەیدا کرد، چەند کۆمەڵ و تاقمێکی جۆراوجۆری لاڕێ ( منحرف ) پەیدابوون کە سەرەکییەکانیان ئەمانە بوون :

( الرافضه ، الخوارج ، المرجئه ، الشیعة ، المعتزله ، الجبریه ، الحشویه ) (1)

---

(1) هەڵبەتە پێڕو دەستەی دیکەش زۆر پەیدابوون کە بە یەکجاری لە شیرازەی ئیسلام چوونەدەرێ و لە (ئەهلی قیبلە) شۆران ، بۆ وێنە ( الباطنیه ) و ( القرامطه )و ( علی اللهی) و گەلێک دەستەو پێڕی دیکە کە بەزۆری لەبن پەردەی ( تشیع ) و ( تصوف ) دا خۆیان حەشار دەدا .

هەڵبەتە شایانی باسە کە هەرکام لەم پێڕو کۆمەڵانە هەر بە مسوڵمان و بە بەشێک لە ئۆممەتی ئیسلامیو بە ئەهلی قیبلە لەقەڵەم دەدران ، لەلایەن جەماوەری زاناو پێشەوایانی( اهل السنە ) ەوە..

جا هەرچەندە ئێستا هیچ کام لەو پێڕو کۆمەڵانە نەماون جگە لە ( رافضەو شیعە ) ، بەڵام بێگومان لیتەولاڵ و ژەنگ وژاری بیروبۆچوونە توندو ئیشک و بێ تامەکانیان بەسەر دڵ و مێشکی هەندێک کەسەوە هەر ماوەو، جاروبار ئەو لیتەولاڵ و ژەنگ وژارە لە شێوەی کۆمەڵ و تاقمی جۆرا وجۆردا خۆی دەنوێنێ، بۆ وێنە کۆمەڵی( التکفیر والهجرە ) کە چەند ساڵێک لەمەوبەر لە میسردا سەری هەڵدا ، لە کاردانەوە ( رد فعل ) ی زوڵمو دەست درێژی ماددی و مەعنەوی بێ سنوورو ئازارو ئەشکەنجەو گرتن و لێدانی بێ

ویژدانانەو دڕندانەی ڕژێمە یەک لەدوای یەکە فیرعەونی یەکانی میسر بوو سەبارەت بە ئیسلامی یەکان .

جا خوێنەری خۆشەویستم !

هەروەک چۆن کاتی خۆی دوای بەسەرچو – ونی چاخی زێڕینی پێغەمبەرایەتی و خەلیفایەتی ڕاستەقینە ، ئەو کۆمەڵ و تاقمانە لەنێو ئۆممەتی ئیسلامیدا پەیدابوون کە باسمان کردن ، ئێستاش لە سەردەمی ئێمەدا چەندان جۆرە تاقم و کۆمەڵی جۆراوجۆر هاتوونە کایەوە کە ژماردن و پێناسەکردنی هەموانیان کارێکی ئاسان نیەو، لەم نامیلکەیەشدا دەرفەتی ئەوەمان نیە ، بەڵام حەتمەن حەتمەن دەربڕینی هەڵوێستێکی ڕاستی شەرعیيانە لەوبارەوەو، دانانی تەرازوو و سەنگی مەحەکێکی ڕاست بۆ هەڵسەنگاندن و لە مەحەک دانیان شتێکی یەکجار گرنگ و پێویستە ، هەروەک چۆن

کاتی خۆی زاناو پێشەوایانمان خـــواﻪ پاداشتیان بداتەوە ئەو پێڕو کۆمەڵانەی ڕۆژگاری خۆیانیان هەڵسەنگاندووە و لە مەحەکی قورئان و سوننەت و شەرعیـــان داون .

جا ئێمە خوا یار بێ بە حوکمـــــی فەرمانی( اولئک الذین هدی اللــــــه فبهداهم اقتده ..) الانعام/ ٩٠ .

هەوڵ دەدەین بە شێوەیەکی گشتـــــی هەڵوێستی ڕێبازی پێغەمبەر صلی اللـــه علیه وسلم لەبەر تیشکی قسەو بڕیـــاری زاناو چاوساغانمان دا لەبارەی هەمــوو ئەو پێڕو تاقمانە بخەینەڕوو، تاکـــو بزانرێ و ئاشکرابێ کامە لەو پێـــڕو کۆمەڵە لاڕێ و سەرگەردانانە لە شیرازەی ئیسلام چۆتەدەرێ و، وە تاکو بزانـــرێ چ کاتێک بۆمان هەیە حوکمی کافربوون و لە ئەهلی قیبلە شۆڕان بەسەر کەسێک دا بدەین ، چونکە حوکمی بەکافردانـــان زۆر گەورەیەو بەدەردی ( القاضی عیاض)

فەرموویەتی: ( .. فان استباحە دمـــاء المسلمین الموحدین خطر، والخطأ فـــی ترک قتل الف کافر اهون من الخطأ فـی سفک محجمة من دم مسلم واحد ..)[1] واتە بێگومان حەلاڵ کردنی ڕشتنی خوێنـــی مسوڵمانانی یەکتاپەرست ( بەهۆی بـــە کافر دانانیانەوە ) مەترسیدارە، وە بە هەڵەدا چوون لە وازهێنان لە کوشتنـــی هەزار کافردا کەمترە لە بەهەڵەداچوون لە ڕشتنی لوێچێک[2] لە خوێنی یــــەک مسوڵمان .

هەڵبەتە چاکترین تەرازووش بریتیە لە پێناسەکردنی بڕوا ( ایمـــــان ) و

---

(1) بڕوانە ( نسیم الریاض فی شـــرح شفاء القاضی عیاض ) ج٤ ص ٤٨٤ ، نووسراوی احمد شهاب الدین الخفاجی .

(2) هەرچەندە ( محجمە ) بەو ئالەتـــە دەگوترێ کە بابای کەڵەشاخگـــر ( حجام ) خوێنی تێ دەکات ، بەلاّم من بە لوێچم لێکدایەوە چونکە ئەو شتـــەش هەر لوێچێکی دەبات .

بێ بڕوایی (کفر) چونکە زانیمان ئینسان بە چ بە بڕوادار لەقەڵەم دەدرێ و، بە چ کافر دەبێو لە ئایین دەردەچێ زۆر بە سێنایی خەڵکمان بۆ هەڵدەسەنگێنرێ .

پێناسەی بڕوا (الایمان) :

" بڕوا " لەلای زۆربەی هەرە زۆری جەماوەری مسوڵمانان (اهل السنه والجماعه) ئاوا پێناسە کراوە :

( " بڕوا " بریتیە لە قەناعەت هێنان و بەراستدانان " تصدیق " ی دڵ بە هەرچی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەخواوە هێناویەتی ) .

( تصدیق القلب بکل ما جاء به رسول الله صلی الله علیه وسلم من عندالله )

بەڵام لێرەدا دەبێ چەند شتێک بخرێنەروو :

١- پێ لێنان (اقرار) ی زمان مەرجی پەیدابوونی (بڕوا) نیە، بەڵکو

بەس مەرجی بە بڕوادارزو بە مسـولٔمان حسێب کرانی مرۆڤە لە حوکمی شـەرعو لە ژیانی دنیادا ، هەربۆیەش کەسێـک پێ لێنانی زمانی لێ ببینرێ حـوکمـی مسوڵمانەتی بۆ دەدرێ مادام شتێکـی وای لێ نەپشکوێتەوە کە بەڵگەبێ لەسەر بێ بڕوایی، هەرچەندە باوای و لـەلای خواش بە بڕوادار ناژمێررێ .

٢- دەربرینی ئەو بەراستدانـان و پێ لێنان ( التصدیق والاقـرار ) ە ، بە گوتنی وشەی شایەتمان ( کـلمـة الشهادە ) ئەنجام دەدرێ کە بریتیە لـە ( اشهد ان لا الە الا اللە واشهـد ان محمدا رسول اللە ) .

٣- زانایانی پێشین ( علماء السلف)مان کە فەرموویانە : ( الایمان هو التصدیق بالجنان والاقرار باللسان والعمـل بالارکان ) واتە : بڕوا بەراستدانانی بەدڵ و دان پێداهێنانی بەزمـان و کردەوەیە بە ئەندامەکان ، مەبەستیان

ئەوە بووە کە کردەوە مەرجی تەواوبوون ( شرط کمال ) ی بڕوایە، نەک مەرجی دروست بوونی ( شرط صحته ) ، بەڵام موعتەزیلەکان بەپێچەوانەوە، کردەوە بە مەرج دادەنێن بۆ دروست بوونی بڕوا .

٤- هەرکەسێک قسەیەک یان کردەوەیەکی لێ بپشکوێتەوە کە بڕوای پێ هەڵنەوەشێتەوە وەک قەتڵ و زینا و نوێژچواندن و زەکات نەدان و سوێند بە غەیری خوا خواردن و .. هتد ئەوە بە لەرێ دەرچوو ( فاسق ) دادەنرێ ، جا ئەگەر جاری وایە لە قورئان و سوننەتدا خاوەنی ئەو جۆرە رەفتارانە بە بێبڕوا ( کافر ) لەقەڵەم دراوە،(١) ئەوە لەو رووەوەیە کە کردەوەو خەسڵەتی کافرانی تێدا هاتۆتەدی ، وە کە بە بڕواداریش

---

(١) ( سباب المسلم فسوق وقتاله کفر ) رواه الستە واحمد الا ابا داوود .( فیض القدیر ) ج٤ ص ٨٤ ژمارە / ٤٦٣٣ .

ناوی هێنراوه (١) ، ئەوە لەو ڕووەوەیە کە بەس حەقیقەت و ئەسڵی بڕوایەکەی لەبەرچاو گیراوە .

بەڵام موعتەزیلەکان دەڵێن بابای ( فاسق) نە بڕوادارەو نە کافر ، بەڵکو لەنێوان هەردووکیان دایە ( منزلة بین المنزلتین !) .

٥- زانایانی پێشین ( سلف) رایان وایە کە بڕوا زیاد دەکاو کەم دەکا ، بەڵام زۆربەی قسەبێژان ( متکلمین ) دەڵێن : نەخێر وانیە ، بەڵام گومانی تێدا نیە کە ڕای یەکەم پەسند ترو بەهێزترەو پڕ بە پێستی واقیعیشە .

---

(١) ( وان طائفتان من المؤمنین اقتتلوا ..) الحجرات / ٩ .

پێناسەی بێ بڕوایی ( الکفر ) :

بێ بڕوایی ڕاست پێچەوانەی بڕوایە، واتە بریتیە لە:

بەڕاست دانەنان و قەناعەت نەبوون بە یەکێک لەو شتانەی کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم لەخواوە هێناویەتی بەمەرجێک ئەو شتە شتێکی ئاشکرای ئینکاری لێ نەکراوی ئایین بێ.

( الکفر هو انکار ما علم من الدین بالضرورە ).

ئیمامی ڕازی فەرموویەتی : ( الکفر : عدم تصدیق الرسول بشئ مما علم بالضرورە مجیئوە بە )[1].

ئنجا ئەو شتانەش کە ئینسان پێیان کافر دەبێ سێ بەشن :

١- کە پەیوەندی یان بە لایەنی بیروباوەڕەوە هەیە، وەک بڕوا بە

---

(١) بڕوانە ( العقیدە الاسلامیە واسسها ) عبدالرحمن حنبکە المیدانی/ص٧١٦.

خوا نەبوون ، یان بڕوانەبوون بە یەکێک لە سیفەتەکانی، یان وەسف کردنی خوا بە سیفەتێک کە لێی ناوەشێتەوە ،وەک وەسف کردنی بەوە کە جەستەی هەیە یان شتێک نازانێ، وە وەک بڕوانەکردن بە یەکێک لە پێغەمبەرانی خوا کە بوونی ئیسپاتە یان بە درۆزن دانانیان ، یان ئینکاری کردنی کۆتایی هاتنی پێغەمبەرایەتی بە ( محمد) علیه الصلاة والسلام .

وە وەک بڕوانەکردن بە فریشتە یان جند ، یان بڕوانەکردن بە یەکێک لە کتێبەکانی خوا ، یان ئینکاری کردنی یەک ئایەتی قورئان ،[1] یان بڕوا نەکردن بە ڕۆژی دوایی‌و بەهەشت‌و دۆزەخ‌و لێپرسینەوەو هەر شتێکی دیکەی لەم بابەتانە (بەمەرجێک بە بەڵگەیەکی دڵنیاکەر (دلیل قاطع)ئیسپات بووبێ ) .

---

(١) کەواتە زۆرچاک بزانە حوکمی ئەوانە چۆنە کە دەڵێن : ئیسلام کۆنەپەرستی‌یەو هیچی هەر بەکەڵک نایەت نەک بەس هەندێکی!

٢- بەشی دووەم لەو شتانەی کە مرۆڤیان پێ کافر دەبێ، پەیوەندی یان بە دەربرینی زمانەوە هەیە، وەک هەر قسەیەک کە دان پێداهێنانی تێدابێ بە بیروبڕوایەکی کافرانەدا، یان ئینکاری کردنی یەکێک لەو شتانەی کە بیروبڕوا (عقیدە) ی ئیسلامی پێک دێنن. (بەمەرجێک بەڵگەی پتەوو گومان نەهێڵی لەسەر بێ) . یان هەر قسەیەک کە گاڵتەپێکردنی ئایینی تێدابێ، جا چ پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە هەبێ، چ بە یەکێک لە یاساکانی، وەک جنێو دان و گاڵتەکردن بە خوداو سیفەتە - کانیو پێغەمبەرەکانیو کتێبەکانی، یان ڕەخنە لەخواگرتن و ستەمو بێدادی پاڵ وێ دانیو گاڵتەکردن بە سوننەت .

جا هەرکەسێک یەکێک لەو جۆرە قسانە بکات ئەگەر کافربێ، ئەوە هەر کافرەو، ئەگەر مسوڵمانیش بووبێ کافردەبێو لە ئوممەتی پێغەمبەرو ئەهلی قیبلە دەشۆرێ.

٣- ئەو شتانەی کە پەیوەندی یان بە لایەنی کردەوەو رەفتارەوە هەیە ، ئەویش هەر کردەوەیەکە کە بە بەڵگەیەکی ئاشکرا دابنرێ لەسەر بیروبڕوایەکی کافرانە ، وەک دڕاندن و سووتاندنی قورئان لەگەڵ هەبوونی بەڵگەی سووکایەتی پێکردن دا ، یان لەنێو پیسی هاویشتنی، وە کڕنووش بۆ بت و صەنەم بردن لەگەڵ هەبوونی بەڵگەی ڕێز لێگرتن دا ، وە وەک بەخۆهەڵواسینی خاچ ( صلیب ) ، وە هەڵگرتنی هەر شتێکی دیکە کە لە نیشانە تایبەتی - یەکانی کافرانن ، وێڕای هەبوونی بەڵگەی بەگەورەگرتن و خۆشویستن ، بە مەرجێک بە توبزی نەبێ، یان لەبەر بەرژەوەندی سیاسەتی مسوڵمانان نەبێ، وەک ئەوە کە مسوڵمانان یەکێکیان بە حاسووسی بنێرنە نێو کافران و ، ئەویش ئەم رەفتارانە بکات بۆ شاردنەوەی حاڵی خۆی و ئاشکرا نەبوونی .

جا مسوڵمانی بەڕێز !

ئەمە بەکورتی‌و گوشراوی پێناسەی بڕواو پێناسەی کوفرو خستنەڕووی بەشێک لەو شتە سەرەکی‌یانە بوو، کە مرۆڤیان پێ کافر دەبێت، کەواتە - سوپاس بۆ خوا - ئێستا تەرازوویێکی ڕاستت لەبەر دەستدایە بۆ کێشان و هەڵسەنگاندنی هەموو ئەو پێڕو تاقم‌و حیزب و ڕێچکانەی کە لەنێو ئوممەتی ئیسلامی‌دا سەریان هەڵداوەو، زوربەی هەرەزۆری خەڵکیش هەر بە مسوڵمان و بە ئەهلی قیبلەیان دەزانێ، بەڵام وەک لە پێناسەی بڕواو کوفردا دەرکەوت ئوممەتی ( محمد ) بوون و بە ئەهلی قیبلە لەقەڵەم دران، هەروا سووک و سادە نیەو مەرج و پێداویستی یەکجار زۆرن و، گەلێک کەس بە خەیاڵی خۆی خۆی بە ئەهلی قیبلەو ئوممەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەقەڵەم دەدات، بەڵام ڕەنگە ڕۆژێ نەک جارێک، چەندان جار، بەدڵ وزمان و

کردەوە کوفری لێ ڕوو بدات بێ ئـەوەی هەست بەخۆی بکات ( وما لجَرْحٍ بِمَيِّتٍ ايلام ) !!

بەڵام لەکۆتاییدا دەڵێم :

کۆمەڵی ( اهل السنة والجماعة ) کـە وەک پێشتر گوتم جەماوەری مسوڵمانانن و کۆمەڵێکی میانەڕەوو ساغ و بێخەڵتەن و لەسەر ڕێ و شوێنی پێغەمبەرو خەتـی چوار خەلیفە ڕاستەکان دەڕۆن ، هەموویان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتوون و یەک دەنگن کە :

ئێمە ئەهلی قیبلە بە کافر دانانێین ( نحن لانكفرُ اهل القبلةِ ) ،بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئێمە دڵنیا و مسۆگەر بین کە فلان کۆمەڵە یان فلان کەسـە ، شتێکی وای لێ نەپشکوتۆتەوە ، لە بیرو باوەڕو قسەو ڕەفتار ، کە پێی لە ڕیزی ئوممەتی ئیسلام بچێتەدەرێ و ، پێی لـە ئەهلی قیبلە بشۆرێ ، چونکە وەک گوتم ئوممەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

بوون.و ئەهلی قیبلە بوون مەرج و
پێداویستی زۆرن و بەس بە ناو یان
ناونووس کرانی ڕووت نایەتەدی.(١)

لە خوای بەرزو میهرەبان و خاوەن
لوتفی فراوان و دادگەریش دا واکارین
کە بمانگێڕێ بە ئەندامانی ڕاستەقینەو
ساغی ئوممەتی موحەممەدو بمان پارێزێ
لەوەی کە هیچ شتێکی وامان لێ ڕووبدات
پێی لە ئەهلی قیبلە بشۆرێین .

ئامین

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لەم
سەرچاوانە وەرگرتوە :
١- ( فتح الباری شرح صحیح البخاری )
ج١ ص ٣٩، ٤٠ .
٢- ( صحیح مسلم بشرح النووی ) ج١
ص ١٤٤ تا ١٥٠ .
٣- ( جمع الجوامع ) ج٢ ص ٤٢٠ .
٤- ( فیض القدیر شرح الجامع الصغیر )
ج٢ ص ١٨٨، ١٨٩ .
٥- ( نسیم الریاض فی شرح الشفا ... )
ج٤ ص ٤٤١ تا کۆتایی .
٦- ( شرح العقائد النسفیه ) ص ٢٠٣ .
٧- ( المواقف فی علم الکلام ) ص ٣٨٤ .

....................................

٨- ( الوَسيلة في شَرْحِ الفضيلة ) ص ٤٤ .
٩- ( فتح المجيد شرح كتاب التوحيد ) ص ٣٥ .
١٠- ( دائرة معارف القرن العشرين ) ج١ ص ٥٩٨ .
١١- ( العقيدة الاسلامية ) ص ٧١٦تا ٧٢٣ .
١٢- ( بروا ) ئالقەی پێنجەمی زنجیرەی ( با چاکتر ئیسلام بناسین ! ) .
١٣- ( الاعلام بقواطع الاسلام ) ابن حجر الهيتمي على حاشية ( الزواجر عن اقتراف الكبائر ) ج٢ له ص ١ تا كۆتايى
١٤- ( تقريب المرام في شرح تهذيب الكلام ) ج٢ ص ٢٨٢ تا كۆتايى .
١٥- ( الحاوي للفتاوى ) للسيوطي ج٢ ص ٢٨٥ ، ٢٨٦ .

# پاشکۆیەکی گرنگ

مسوڵمانی سەنگین و شیرین !

گوتراوە ( الاحسان بالتمام ) ! جا منیش بەپێویستی دەزانم لەم پاشکۆیەدا جارێکی دیکەش بەڵام بەخێرایی، جڵەو بۆ ئەسپی قەڵەم شل بکەمو ماوەیەکی دیکەش لە مەیدانی ڕوونکردنەوەو پێناسەکردنی( ڕێبازی پێغەمبەر ) دا صلی الله علیه وسلم ،ڕمبازێن و ئەمسەرەو سەری بکات ، بۆئەوەی هەرچی زیاتر ، چاکتر ڕێ و شوێن و ڕێبازی پێغەمبەرمان علیه الصلاة والسلام بدرەوشێتەوەو، هەم ڕواڵەت و درووشمەکانیو هەم نێوەڕۆک و بنچینەکانی هیچ تەمومژی نەناسراوی ( مجهولیة ) یان لەسەر نەمێنێ، تاکو وەک خوا فەرموویەتی :( .. لِيَهْلِكَ مَن هَلَكَ عَنْ بَيِّنَةٍ ويحى من حَيَّ عن بَيِّنَة .. ) الانفال / ٤٢ .

هەم کەسانێک کە خۆیان بە شوێنکەوتووی پەیڕەوو ڕێبازی پێغەمبەر صلی اللـــە علیە وسلم دەزانن ، بزانن بـــەدوای چ کەوتوون و دەبێ چۆن بن و چ بکـــەن و چ بڵێن !

وە هەم کەسانێکیش کە کەیفیان بـــە ( نائیسلامی ) بوونێ دێ و ، پشت لـــە بەرنامەی پێغەمبەر دەکەن و لـــــە ڕێبازی وی دەترازێن و لادەدەن ، بزانن چ کارەن و چیان بەسەردێ و چ دەکەن !

جا وەک پێشتر بەڵێنمان داوە خـــوا پشتیوان بێ لەم پاشکۆیەدا هەشت (٨) مەسەلەی گرنگ و زیندوو دەتوێژینـــەوە ، بەڵام دەبێ بزانرێ کە ئەوپەڕی کورتی ی گونجاو ڕەچاو دەکەین .

## یەکەم : زانیاری ( العلم )

١ـ وشەی زانیاری ( علم ) بەهەموو شێوە بەکارهێنانەکانی‌یەوە دەوری ( ٧٧٨ ) جار لە قورئانێدا هاتوە.(١)

٢ـ وشەی ناوبراو وەک زانایانی زمان ( علماء اللغه ) دەڵێن پێچەوانەو دژی نەزانین ( جهل ) ە.(٢)

٣ـ زانیاری لە روانگەی ئیسلامەوە پێنج حوکمە شەرعی‌یەکانی بەسەردا دەچەسپن :

آـ زانیاری هەیە فەرزە، ئەمیش دووجۆرە : یەک : فەرزی عەین، کە لەسەر هەموو ئینسانێک پێویستە وەک زانیاری هەبوون بە ناسینی خوا و، پێغەمبەرو صلی اللـه علیە وسلم باقی پایەو بنچینەکانی ئیسلامەتی، دوو : فەرزی کیفایە، کە

---

(١)،(٢) بروانە ( معجم الفاظ القرآن الکریم ) ج٢ مجمع اللغه العربیه، هەروەها بۆ(٢) بروانە ( لسان العرب)ج١٢.

لەسەر هەموو خەڵکی مسوڵمان پێویستە، بەڵام ئەگەر هەندێکیان وەدەستیان هێنا لەسەر ئەوانی دیکە لادەچێ، وەک زانیاری هەبوون بە چۆنیەتی ڕاستڕاگەیاندنی ئیسلامو بەرگری (دفاع) لێکردنیو بەرپەرچ دانەوەی پروپاگەندەو قسەو قسەلۆکی ناحەزان، وە وەک هەموو ئەو زانیاریانەی کە پێویستن بۆ بەرەوپێش بردنی ئاستی ژیان و بەرگری کردن لە خاکی ئیسلامیو جەنگ کردن لەگەڵ دوژمن و ناحەزان دا، ئیمامی غەززالی لەوبارەوە فەرموویەتی :

( ئەگەر مسوڵمانان پەکیان لەسەر شتێکبکەوێ و نەزانن دروستی بکەن و حەوجێی غەیری خۆیان بن، هەموویان تاوانبارن ) ![1]

ب– وە زانیاری هەیە سوننەتە، ئەویش ئەو جۆرەیە کە دروستکردنی شتێکی پەسندو چاک – نەک پێویست – یان ئەنجامدانی سوننەتێک پەکی لەسەری

(١) بڕوانە ( الاحیاء ) ج١ ص ١٦ .

بکەویٚ ، وەک زانیاری هەبوون دەربارەی ریش هیٚشتنەوەو سیواک کردن و سوننەتی چیٚشتەنگاو .

ج ـ وە زانیاری هەیە موباحە ، ئەویش ئەو جۆرەیە کە نە شتیٚکی فەرزو نە شتیٚکی سوننەت و پەسند پەکی لەسەری نەکەوتوە ، وەک زانیاری هەبوون بەوەی داخوا لە بوونەوەردا جگە لە مرۆڤ گیانلەبەری دیکە لە هەرۆکەکان دا هەیە یان نا .

د ـ زانیاری واش هەیە ناپەسند (مکروه)ە ئەویش ئەو جۆرەیە کە پەیوەندی بە شتیٚکی ناپەسندەوە هەیە وەک زانینی دامەو دۆمینەو شەترەنجو کەلەمستیٚنە[1] یان خویٚندنەوەی ئەو کتیٚب و گۆڤارانەی کە بەبیٚ سوود تەمەنی مرۆڤ بەزایە دەدەن .

---

(۱) ئەم جۆرە یاری یانە ئەگەر لەسەر شت نەبن ناپەسندو پووچ ( لغو ) ن ، بەلاّم ئەگەر لەسەر شتی بن حەرامن .

ه ـ جۆری پێنجەمیش بریتیە لە زانیاری
قەدەغە ( حرام ) ، ئەویش هەر
زانیاری یەکە کە بۆ ئەنجامدانی
کارێکی خراپ و بێ شەرعی وەدەست دێ
وەک زانیاری هەبوون دەربارەی تۆمەت
ـە ئیسلام گرتن و ، چۆنیەتی دزی و
ڕێگری و ماڵ بڕین .

نیّ ببینی:

فیّربوونی زانیاری جادوو ( علم
لسحر ) بۆ ئاگادار بوونی ڕەفتاری
ادووگەرانەو ، پووچاندنەوەی بەمەرجێک
ردەوەی بێ شەرعیانە لە فیّربوونەکەیدا
ـەبێ، دروستە ، هەروەها خوێندنەوەی
تێبی بێ بڕواو خوانەناسان بەمەبەستی
ـەرپەرچ دانەوەیان دروستەو جاری وایە
ەبێ بە سونەتیش و فەڕزیش .

## دووەم : سیاسەت

١- وشەی سیاسەت ( السیاسە ) کە لە کوردی دا ( ڕامیاری ) بۆ دانراوە لە فەرهەنگەکانی زمانی عارەبی دا بە مانای کاروبار هەڵسووڕاندن و مشوورخواردن و بارهێنانە .(١)

٢- وە وشەی ناوبراو لە فەرموودەی پێغەمبەردا طلی اللە علیە وسلم هاتوە ،( کانَ بنو إسرائیلَ یَسوسُهُم أنبیاءُهم ..) رواه البخاری .

٣- وە سیاسەت کە ئێستا خەڵکی عەوام بەهەڵە پێیان وایە لە ئەسڵ دا بە مەعنای فڕوفێڵ و تەڵەکەبازی یە ، بۆیە ئینکاری ئەوە دەکەن کە ئیسلام سیاسەتی تێدا بێ! وەک گوتمان لە ئەسڵ دا یانی کاروبار هەڵسووڕاندن و بەڕێوەبردن و مشوور لێ خواردن ، دیارە ئامانجی هەموو بەرنامەکانی خواش بەتایبەتی بەرنامەو پەیڕەوی ( محمد ) صلی اللە

(١) [illegible] ج٦ ص ١٠٨ .

علیە وسلم هەر بریتی بووە لە کاروبار هەڵسووڕاندن و سەرپەرشتی کردنی خەڵکیو چارەسەرکردنی گیروگرفتو کێشەکانیان و، لابردنی ستەمو خراپەو چەسپاندنی دادگەری و چاکە، مادام وابێ دەبێ بڵێین: ئیسلام نەک هەر سیاسەتی تێدایە، بەڵکو سیاسەت بڕبڕەی پشتی ئیسلامە !!

ئنجا دەڵێین: گومانی تێدا نیە کە سیاسەتی غەیرە ئیسلامی، سیاسەتی درۆو دەلەسەو فرۆفێڵ و چاوبەستەکێیە، بەلاّم ئێمە قەت دەست بەرداری ئەو وشەو زاراوانە نابین کە خۆیان لە خۆیاندا چەمک و واتایەکی ڕاستیان هەیە بەلاّم شێوێنراون. (١)

(١) توێژینەوەی مەسەلەی ( سیاسەت ) ئاڵقەی دەیەمی زنجیرەی ( با چاکتر ئیسلام بناسین !) ی بۆ تەرخان کراوە.

## سێ یەم : دادگەری ( العداله )

١- وشەی دادگەری( عداله ) بەهەموو شێوە بەکارهێنانەکانی‌یەوە (٢٨) جاران لە قورئانێدا هاتوە .(١)

٢- وە وشەی ناوبراو (٣) واتای هەن :

آ- راست وڕێک دژی خوار ونا ڕێک(جَوْر)

ب- حوکم کردن بە هەق .

ج- باوای قسەو ئاکار پەسند.(٢)

٣- دادگەری یەکێکە لە (٩٩) سیفەتە بەرزو پەسندەکانی خوا ، وە خـودا فەرمانی پێ کردوە ( إِنَّ اللّه يَأمُرُ بِالْعَدْلِ ..) النحل / ٩٠ .

پێغەمبەریشمان صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:( حەوت جۆرە کەس لەڕۆژی دوایی‌دا کە جگە لە سێبەری لوتفی خودا

---

(١) بڕوانە ( معجم الفاظ القرآن الكريم ) ج٢ وە ( المعجم المفهرس لالفاظ القرآن الكريم) محمد فواد عبدالباقی.
(٢) بڕوانە ( لسان العرب ) ج١١ ص ٤٣٠.

هیچ سێبەرێکی دیکە نیە، خوا دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، یەکەمیان (امام عادل) پێشەوایەکی دادگەرە!
متفق علیه.

وە چەسپاندنی دادگەری (القِسْط - العَدْل) مەبەست و ئامانجێکە هەموو پێغەمبەرانی بۆ رەوان کراون علیهم افضل الصلوات واتم التسلیمات، وەک خوا فەرموویەتی: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالبَيِّنَاتِ وأَنْزَلْنَا مَعَهُمَ الكِتابَ والمِيزان لِيَقُومَ النَّاسُ بِالقِسْطِ وأَنْزَلْنا الحَديد..) الحدید/٢٥.

٤- وە بەبێ هێزو دەسەڵات ناگونجێ دادگەری بچەسپێنرێ و ستەمو بێدادی لەنێو ببرێ، بۆیەش خوای قسەلەجێ یەکسەر دوای ئەوەی باسی چەسپاندنی دادگەری کردوە فەرموویەتی (.. وأَنزَلْنا الحَديدَ)! ئاسنیشمان دروست کردوە![1]

---

(١) مەسەلەی (دادگەری) لە ئاڵقەی یازدەیەمی زنجیرەی (با چاکتر ئیسلام بناسین!) ...

## چوارەم : نەتەوایەتی ( القومیە )(١)

١ـ ئێمە مەسەلەی نەتەوایەتی بەمەرجێک لە سنووری سروشتیی خۆی دەرنەچێ، کە بریتیە لە هەست ونەسبت، و خۆشەویستی ـ یەکی سادەو بێ غەرەز سەبارەت بە گەل و نیشتمان ، ئەوە بە یەکێک لە غەریزە رەسەن و سروشتی یەکانی ئینسانی دەزانین .

٢ـ بەلاّم کە لە شیرازەی ناوبراو دەرچوو و چووە قالبی بیروباوەر ( ئیدولۆژی ) ەوە، ئەوە ئەو کاتە زەربێکی بەسەردا دێنین و بە جۆرێک لە جۆرە نوێ یەکانی بتپەرستی لەقەلەم دەدەین .

٣ـ قەت پێمان وانیە کە بیری نەتەوایەتی ( الفِکرةُ القومیە ) هیچ گەلێکی

---

(١) مەسەلەی نەتەوایەتی بە تێروتەسەلی لە ( سۆزی نەتەوایەتی )دا تویژراوەتەوە کە ئالقەی چوارەمی(ئیسلامو رێچکان)ە .

چەوساوەی پێ بگاتە هەواری سەربەخۆیی، ولاتە ئەوروپاییەکانیش کاتی خۆی بەهۆی بیری نەتەوەپەرستیو ڕەگەزپەرستی - یەوە گەورەترین زیانیان لێ کەوت و گیرۆدەی دوو جەنگی جیهانی ماڵ ویرانکەر بوون کە چەندان ملیۆن کەسیان تێدا لەنیوچوو. تورکەکانیش هەر هەمان دەردیان تووش بوو و سەرەنجام خەلافەتی ئیسلامیەیان لەدەست چوو، عارەبەکانیش بەوانەی پێش خۆیان تەمێ نەبوون و، کاتێک بەهۆی جوولەکانەوە ڕیشیان تیوەچوو، دەستیان بۆ شانەی عارەبایەتیو ڕەگەزپەرستی برد، بەلام دەستیان لە بنی هەبانەیەوە دەرچوو. جا نازانم گەلە بێکەسو مافخوراوەکەی خۆشمان پەند وەردەگرێ یان ئەویش بەدوا وان دا دەڵی فجوو! (۱)

---

(۱) بە دەنگی فڕینی کەوی دەڵێن (فجوو).

## پێنجەم : کورد

١- کوردیش گەلێکە وەک هەموو ئەو گەل و نەتەوانەی جیهان کە خوا نیشتمان و زمانێکی تایبەتی خۆی پێ بەخشیوە .

٢- گەلی کورد یەکێکە لەو گەلانەی کە بەهەموویان ئۆممەتی ئیسلامی پێک دێنن ، وە کورد لەچاو خۆی و بارودۆخی سیاسی ناهەمواری دا گەورەترین پشکی هەیە لە دروستکردنی شارستانەتی و مێژوو و ئەدەب و کەلەپووری ئیسلامیدا .

٣- " کورد" لەمێژە بوون و کیانێکی سیاسی سەربەخۆی بەخۆوە نەدیوە ، لە زوربەی زۆری ئەو مافە سروشتیانەی کە خوا بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەکی بریار داوە بێ بەش کراوە ، ئاشکراترین دیاردەی ئەو بێ بەشکران و ستەم دیدەیی یەی کورد ئەوەیە کە نیشتمانەکەی کراوەتە چوار پێنج لەت و

هەر لەتەی دراوەتە ولاتێک ، وە لەگەڵ ئەوەش دا کە لە زۆر لە گەل و نەتەوە ـ کانی جیهان ژمارەی پترە ، هەتا ئێستا دەولەتۆکەیەکیشی نیە !!

بەڵێ کورد : بێ بەش ترین و چەوساوەترین گەلی جیهانە !

۴ـ مەسەلەی کورد تەنیا بەوە چارەسەر دەکرێ کە وەک هەموو گەلانی دیکەی دنیا بە مافە رەوایەکانی خۆی بگات و لە نیشتمانی خۆی دا ئازادو سەربەخو بێت ، ئەمەش بەس بە دوو شێوە چاوەروان دەکرێ :

یەکەم : هەروەک چۆن پاکستان و عارەبستانو ئەفغانستان و تورکستان و ..هتد هەن و سەربەخۆن ( کوردستان ) یش سەربەخۆش هەبێ !

دووەم : ئەگەر بگونجێ هەموو ئۆممەتی ئیسلامی لەژێر سایەی یەک دەولەتی ئیسلامی بەرفراوانی ئیسلامی دا کۆببێتەوە ، کوردستانیش ناوچەیەک و

ویلایەتێکی سەر بە دەوڵەتی مەرکەزی بێ !

٥ ـ ڕێگەی بەمراد گەیشتنی کوردو هەر گەلیکی دیکەی چەوساوەش تەنیا و تەنیا شۆڕش کردن و خەبات و جەنگە ، بەڵام ئەو شۆڕش و خەبات و جەنگەش بەبێ هەبوونی دوو مەرجی بنەڕەتی ئەنجامی نابێ ؛

١ـ ئیسلام کردنە بەرنامەی سەرتاسەری ژین .

٢ـ پشت بە خوا و بەخۆ بەستن .

دیارە ئەوەی دووەمیشیان بەرهەمو ئەنجامی حەتمی مەرجی یەکەمیانە .

## شەشەم : ئافرەت

١- ئەگەر پیاو بە ( ئینسانێکی نێر ) پێناسەبکرێ ، ئافرەتیش لەڕوانگەی ئیسلامەوە ( ئینسانێکی مێ ) یەو هیچیدی! کەواتە جیاوازی نێوان ئافرەت و پیاو بەس نێرایەتی‌و مێیایەتی‌یەو ، ئنجا ئەو نێرایەتی‌و مێیایەتی‌یەش هەریەکەی جۆرە ئەرک ( وظیفە ) و شێوە هەڵس و کەوتێکی کۆمەڵایەتی تایبەتی بۆ هەرکام لە پیاوو ئافرەت داخواز دەکات .

٢- کەواتە ئافرەت نە لەوەدا کە ئینسانەو نە لەوەدا کە بەندەی خوایەو مسوڵمانە ، هیچی لە پیاو کەمتر نیەو یەکسانن .

٣- بەختەوەری و ئازادی و ماف وەدەست هێنانی ڕاستەقینەی ئافرەت لە پابەندبوونی دایە بە بەرنامەی خواوە ، کە لە جێبەجێ کردنی ئەرکی پیرۆزی ژن ( زوجە ) ایەتی‌و دایکایەتی‌دا خۆی دەنوێنێ .

٤ـ ئافرەت لەکاتێک دا لە بەرنامەی خوا لادەدات و ڕوو لەملاولا دەکات و بە قسەی ناکەس بەچانی نیازپیس فریو دەخوات ، دووچاری دەردی پڵیشانەوەو بێ ناو بوون و ، ئابڕووتکان و زەبوون بوون دەبێ !

٥ـ گەلێک جاران مسوڵمانانی لە ئیسلام دوور بەناوی ئایینەوە ستەمیان لە ئافرەت کردوەو لە مافە ڕەوایەکانی بێ بەشیان کردوە ، بۆ وێنە (ئازادبوون لە هەڵبژاردنی هاوسەردا )، ( دەربڕینی بیرورا لە هەر بوارێک دا )، ( ڕێز لێ نەگیرانیو بە کەمو سووک سەیرکرانی) ( ڕێگەی خوێندن و فێربوون لێ گیرانی)

٦ـ بەڵام لەولاشەوە دیسان جارێکی دیکە بەناوی ئازادی و سەربەخۆیی و داواکردنی ماف و .. چیو چی یەوە ئافرەتی کلۆڵ گیرۆدەی دەردی لەئافرەت شۆران و ئابڕووتکان بووەو بەمەرەدێ ئەو کەسە چووە کە ( لە کۆلکێ ڕەوی یەوە

بەسەر بەرازی داکەوت ) .
٧- لەکاتێک دا حوکمو بەرنامەی ئیسلامی بەشێوەیەکی ڕاست بەڕێوە ببرێ ، مەسەلەیەک بەناوی ( کێشەی ئافرەت ) لە هیچ ڕوویێکەوە لەگۆڕێ دا نابێ .

## حەوتەم : ئازادی ( الحریە )

١- لەڕوانگەی ئیسلامەوە ئازادی دوو مەعنای هەن ؛
آ- ئازادبوون و ژێردەستەو ژیرچەپۆک نەبوونی ئینسان و پاریزرانی کەسایەتی( شخصیە ) ی لە کوێلەیی و پلێشێنرانەوە .
ب- بەرهەڵدایی و بێ بەندوباری ئینسان و گوێ نەدانی بە هیچ شیرازەو سنوورێکی خودایی و ئینسانی ؛ وەک ئایین و ڕەوشت و عورف و بەرژەوەندی خەڵکی .

٢ـ دیاره ( ئازادی ) لەڕوانگـــــــەی ئیسلامەوە بەس بە مەعنای یەکەمیان بەڕاست دادەنرێ و ، ئی دووەمیان کـــە فەلسەفەی بوونایەتی( الوجودیـــــە ـ اگزیستانسیالیزم ) بە تۆبزی بەمـــــل وشەی ئازادی دابڕیوە ، بەرهـەڵدایـی و ئاژەڵایەتی یە .

٣ـ کەواتە لەڕوانگەی ئیسلامەوە ئازادی مافی ڕەوای هەموو کەسە ، بـــــەڵام بەمەرجێک کە لە شیرازەی شـــــــەرع نەچێتەدەرێ و نەبێتە هۆی تێداچوونـــی ئازادی خەڵکی دیکەو زیان لێدانیان .

٤ـ ئەوانەی کە بە درۆ یان بە نەزانـی تۆبزی لێکردن ( اجبار ) پاڵ دەدەنە لای ئیسلامو پێیان وایە بە زەبری شیــرو تیر بەسەر خەڵکیدا سەپێنراوە خـــراپ بەهەڵەدا چوو ون ، چونکە خوا بەڕاشکاوی فەرموویەتی: ( لە وەرگرتنی ئاییـــن دا تۆبزی کردن نیە ) ( لا إِکْرٰاهَ فی الدین ) البقره/ ٢٥٦ .

٥- ئیسلام دەیەوێ هەمووکەس هەروەک چۆن بەئازادی دەبێ، هەر بە ئازادیش بژیەت و نەیەلێ هیچ کەس ئازادی لێ زەوت بکات و بی چەوسێنێتەوە، لەو بارەشەوە دەق زۆرن بۆ وێنە: (لاتَظلِمون ولاتُظلَمون) البقرە/ ٢٧٩.

پێغەمبەریش صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: ( لاینبغي للمؤمن أن یذل نفسه ) رواه احمد وابن ماجه والترمذی وصححه.

خەلیفەی دووەمیش عومەری کوری خەتتاب خوا لێی رازی بێ بە دەستەلاتدارێکی فەرموو کە ستەمی لە هاو ولاتی یەکی هەژار کردبوو: ( متی استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتهم أحراراً ؟! ) (١)

لەکەیەوە خەلکتان کردوە بە کۆیلە! خۆ بە ئازادی لە دایکیان بوو بوون ؟!

---

(١) بروانە ( الفتوحات الاسلامیه ) ج ٢ ص ٤٤٥ السید احمد بن زینی دحلان.

## هەشتەم : بیدعەت

١ـ وشەی بیدعەت ( البدعه ) لە ئەسڵی زمان دا بە شتێک دەگوترێ کە لەنوێ پەیداکرابێ و داهێنرابێ و پێشتر نەبووبێ، وە لە ڕوانگەی شەرعەوە بەوە دەگوترێ کە شتێکی تازە لە ئایین دا دابهێنرێ ، هەڵبەتە وشەی ناوبراو مەگەر چۆنەکایی دەنا هەر بۆ زەم کردن و بەخراپ دانانی شتێک بەکاردێ!(١)

٢ـ لەکۆنەوە هەتا ئێستاش مشتومڕو کێشەیەکی زۆر لەبارەی بیدعەت لەنێوان زانایان دا هەیە، کە بەگشتی لەوبارەوە بوونە دوو دەستەو دوو هەڵوێستی پێچەوانەی یەکدییان هەڵبژاردوون :

دەستەی یەکەم: کە زیاتر پابەندبوون

---

(١) بڕوانە ( لسان العرب ) ج٨ ص ٦ وە بڕوانە ( النهایة فی غریب الحدیث والاثر) ابن الاثیر/ ج١ ص ١٠٦، ١٠٧ .

بە دەقان ( الالتزام بالنصوص ) یان ڕەچاوکردوە، ڕایان وایە کە هەموو جۆرەکانی بیدعەت حەرامن، چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ( .. وإيّاكم ومُحَدّثاتِ الأمُور فَإنّ كُلَ بدْعَةٍ ضَلالة ) رواه ابوداود والترمذی وقال حسن صحيح.

دیارە لێرەدا هیچ کام لە جۆرەکانی بیدعەتی هەڵنەواردوەو جیا نەکردۆتەوە بەڵکو بەگشتی حوکمی گومرایی بەسەردا داون. وە دەڵێن: ئەو فەرموودەیەی خەلیفەی دووەمیش خوا لێی ڕازی بێ دەربارەی بە کۆمەڵ کردنی نوێژی تەراویح ؛ ( نعمة البدعة هذه ) مەبەست لە بیدعەت لێرەدا بیدعەتی زمانەوانی ( البِدْعةُ اللّغَويّة ) یە نەک بیدعەتی شەرعی، چونکە بیدعەت لەڕوانگەی زمانەوە بە هەر شتێکی چاک و تازەبابەت دەگوترێ بێ ئەوەی ئەوە ڕەچاوبکرێ داخوا پێشتر ئەسڵێکی هەبووە یان نا، بەڵگەشمان

ئەوەیە کە لەپێش عومەردا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چەند شەوێک لە مزگەوتێ لەگەڵ هاوەڵانیدا نوێژی تەراویحی بەکۆمەڵ کرد، (١) ئنجا ئەگەر گریمان مەبەستی عومەر خوا لێی رازی بێ بیدعەتی شەرعیش بووبێ، ئەوە دەڵێین جگە لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هیچ کەس ( معصوم ) نیەو، هەموو قسەیەکی لێ وەرناگیرێ! (٢)

ئەمە بەکورتی بیرورا و بۆچوونی دەستەی یەکەمە دەربارەی بیدعەت، لەنێو ئەم دەستەیەشدا ئەم زانا پایەبەرزانە دەبینرێن: ( ابن تیمیە الشاطبی، ابن الجوزی، محمد بن عبدالوهاب، رشید رضا الصنعائی ) .

---

(١) بروانە (اقتضاء الصراط المستقیم ) ابنْ تیمیە لە ص ٢٦٧ تا ٢٩٩، وە بروانە ( حوار مع المالکی فی رد منکراتە وضلالاتە ) ص ١٤١ .

(٢) ( اقتضاء الصراط المستقیم ) وە ( سبل السلام ) ج٢ ص ١٣، ١٤/ محمد بن اسماعیل الصنعائی .

دەستەی دووەم :

ئەم دەستەیە زیاتر ڕووحـــــــــی ئاسان کردن و بەرژەوەندی ڕەچاوکردنـی ئیسلامیان لەبەرچاو گرتوە، وە دەڵێن : ئەو فەرموودەیەی کە ئێوە - ئـــــەی دەستەی یەکەم !- بە بەڵگەی دێننـــــەوە هەرچەندە حوکمێکی گشتی تێدایە سەبارەت بە هەر داهێنراوێک، بەڵام چـەنـــدان بەڵگە ناچارمان دەکەن کە حوکمەکـــەی تایبەت ( تخصیص ) بکەین بەو جـــــۆرە شتانەوە کە لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێن و لە قورئان و سوننەت و ئیجمـــــاع و قیاس و .. هتد دا پاڵپشتێکیان نیـــە، ئەو بەڵگانەش کە ناچارمان دەکەن ئـەم هەڵوێستە پەسند بکەین و هەموو جـــۆرە بیدعەتێک بە خراپ ( سیئة ) نەزانیـن و دان بە بوونی بیدعەی چاک ( البدعـــة الحسنة ) یش دا بێنین، ئەمانـــــــــە هەندێکیانن :

یەک : ئێمە ئەوە ناسەلمێنین کــــــە

مەبەستی عومەر رضی الله عنه لــــــە ( نعمتِ البدعةِ هذه ) دا بیدعەتـــــــی زمانەوانی یە .

دوو : فەرموودەی :( من سَنَّ فی الأسـلام سُنَةً حَسَنَةً فَلَهُ أَجْرُها وأَجرُ مَنْ عَمِــلَ بِها ..) رواه مسلم ، حوکمی فەرمــوودەی ( فَإنَّ کُلَّ بِدعةٍ ضلالە ) تایبەت (تخصیص ) دەکات بە بیدعەتی ناشەرعی و بـــــێ پشت و پەناوە .

سێ: هەرگام لە نووسینەوەو کۆکردنەوەی قورئان لە دووتویی (مصحف) ێک داو ، کۆکردنەوەو نووسینەوەی سوننــــەت و ، فێرکردنی ڕێزمانی عارەبیو ، نووسینـــــی مێژووی ئیسلامو .. هتد لەلایەن هاوەڵانی پێغەمبەرو شوێن کەوتووانیانەوە خـــوا لێیان ڕازی بێ ، بیدعەت بوون و کەسیش بۆی نیە بڵێ نەدەبوو کرابان !

ئەمەش بەکورتی چۆنیەتی هەڵوێست و بۆچوونی دەستەی دووەم بوو سەبارەت بە مەسەلەی بیدعەت ، هەڵبەتە شایانـــــی

باسه كه ئه‌مان زوربه‌ی هه‌ره‌زۆری زانایانن و، به‌س بۆ وێنه ناوی هه‌ندێكانیان دێنین :
( العز بن عبدالسلام، النووي، ابن حجر العسقلاني، ابن حجر الهيتمي، السيوطي، الشوكاني، ابن رجب، ابن الاثير ) .

٣- هه‌ڵوێستی ئێمه له‌باره‌ی بیدعه‌ته‌وه :

پاش موتالاو لێكۆڵینه‌وه‌یه‌كی زۆرو به‌راوردكردنی قسه‌ی زانایان و له‌بێژینگ دان و هه‌ڵسه‌نگاندنیان به بێژینگی عه‌قڵ و ته‌رازووی نه‌قڵ ، ده‌رباره‌ی مه‌سه‌له‌ی بیدعه‌ت گه‌یشتمه ئه‌م قه‌ناعه‌ته جا ئه‌گه‌ر ڕاست بێ له‌خواوه‌یه‌و ئه‌گه‌ر هه‌ڵه‌ش بێ ئه‌وه ئی خۆمه‌و ماڵی قه‌ڵبیش سه‌ر به خاوه‌نیه‌تی :
آ- ئه‌من پێم وایه به خستنه‌ڕووی پرسیارێك و وه‌ڵامدانه‌وه‌یه‌كی

ڕاستو واقیعی کیشەو تیک گیرانی ئەو دوو کۆمەڵە زانایەی کە باسمان کردن چارەسەر دەبێو، لە ئەنجامی ئەوەش دا بیرورا و هەڵوێستێکی دیکەی سێ یەم پەیدا دەبێ کە ئەمن بە هەڵوێستێکی پەسندو ڕاستی دەزانم لەبارەی بیدعەتەوە، پرسیارەکەش ئەمەیە :

ئایا مەبەستی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە وشەی ( البدعه ) چ بووە ؟!

ئەمن پیێم وایە وەڵامی ڕاستی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە بڵێین :

مەبەستلە بیدعەت لەڕوانگەی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم ئەو جۆرە بیدعەتەیە کە لەبواری خواپەرستی( العباده ) دا دادەهێنرێ واتە لەبواری نوێژو ڕۆژوو و زیکرو حەجو دووعاو قوربانی سەربڕین و شت لەخۆگرتن ( نذر ) و سوێندخواردن و .. هتد دا .( والله ورسوله اعلم ) .

چونکە وەک زانای پایەبەرزو خواناس ـ کە زۆر کەس بە نەزانیو بێ ئاگایی دژایەتی دەکەن ـ ( شیخ الاسلام ابن تیمیه ) فەرموویەتی :

( إنَ تصرفات العِباد مِن الأفعال والاقوال نوعان : عِبادات يصلح بها دينهم ، وعادات يحتاجون اليها في دنياهم ، فباستقراء اصول الشريعه نعلم ان العبادات التي اوجبها الله او احبّها لا يثبت الامر بها الا بالشرع ، واما العادات فهي ما اعتاده الناس في دنياهم مما يحتاجون اليه ، والاصل فيه عدم الخطر ... ولهذا كان احمد وغيره من فقهاء اهل الحديث يقولون : ان الاصل في العبادات التوقيف فلا يشرع منها الا ما شرعه الله ، والا دخلنا في معنى قوله : ( أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مالَمْ يأذَنْ بهِ الله ؟! ) الشورى / ٢١ ) (١)

---

(١) بڕوانە ( القواعد النورانيه الفقهيه )

پوختەی مەبەست ئەوەیە کە بەرنامەی خوا دوو بەشە :

١- خواپەرستی ( عبادة ) یەکان ، کــــە ئەسڵ لە خواپەرستیدا هەبوونــــی دەق ( نص ) ە و ڕاوەستانە لە سنــووری دەقان دا .

٢- هەڵس وکەوت ( معاملە ) ەکان ، کــە ئەسڵ لەمان دا ڕێگەدان ( اباحە ) ە مەگەر دەق هەبێ لەسەر قەدەغەکرانیان.

ب- بەڵێ لەڕاستیدا ئەگەر بــــەوردی سەرنج بدەینە قورئان و ســـوننەت و ڕێ وشوێنی پێغەمبەرو چوار جێ نشینـــە ـ کانی، زۆرچاک بۆمان دەردەکەوێ کــە مەبەستی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم لە وشەی بیدعەت ، بەس ئەو شتانەن کــە

...............................

ابن تیمیە / ص ١١٢، ١١٣، وە بڕوانـــە ( الحلال والحرام فی الاسلام ) ص ٢١، ٢٢ د . یوسف القرضاوی .

لەبواری خواپەرستیدا دادەهێنرێن ، دەنا چۆن عەقڵ دەیگرێ و چۆن لەگەڵ ڕووحی قورئان و سوننەتدا دەگونجێ کە هەموو شتێک لە هەموو بوارێکی ژیان دا کە لەدوای پێغەمبەرەوە پەیدا بووەو دەبێ بە داهێنراوێکی گومڕایانە دابنرێ !! ئنجا مادام بتوانین مانایەکی وا بۆ وشەی بیدعەت ڕەچاو بکەین کە پڕ بە پێستی بێ‌و بەڵگەی زۆرو زەوەندیش لە عەقڵ و نەقڵ پشتگیری بکەن ، بۆچی ملی مانایەکی وا بگرین کە ناچارمان بکات دەست بکەین بە تەئویل و تەئویلکاری و تایبەت کردن ( تخصیص ) و گچکەکردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم !!

ج ـ کەواتە ئەمجار هیچ پێویست ناکات بڵێین : بیدعەت پێنج حوکمەکانی ( الاحکام الخمسه ) ی بەسەردا دەچەسپێن، واتە: بیدعەت هەیە فەرزەو هەیە

سوننەتەو هەیە موباحەو هەیە ناپەسند ( مکروە ) ەو هەیە حەرام !! بەڵکو دەڵێین : بیدعەت وەک پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بێ پێچوپەنا فەرموویەتی: هەمووی گومڕایی یەو لە ئاگری دۆزەخدایە ، بەڵام ئەو شتانەی کە بەنموونە دەهێنرێنەوە بۆ جۆرەکانی بیدعەتی فەرزو سوننەت وەک : ( کۆکردنەوەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرو صلی الله علیه وسلم نووسینی زانیاری یەکان و تۆقەکردن دوای نوێژەکان و دروست کردنی قوتابخانەو .. هتد ) هیچ کامیان بە بیدعەت دانانرێن ، چونکە ناکەونە جوغزی خواپەرستی( عبادە ) یەوە بەڵکو لە لیستەی هەڵس وکەوتان ( معاملات )دان ، هەر شتێکیش بکەوێتە جوغزی(معاملات)ەوە فەرموودەی گۆرین نایگرێتەوەو ، بۆ حەرامبوون و ناپەسندبوونی دەبێ سەرنجی خودی خۆی بدەین و بەڵگەی دیکەی لەسەر بێنینەوە.

د- وە هەر لێرەشدا سادەیی ئەوانەمان بۆ دەردەکەوێ کە لەسەر دیاردەیەکی وەک ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی یادی لەدایک بوونی پێغەمبەرەوە صلی اللە علیە وسلم دەیکەنە بگرەوبەردە، چونکە ئەو ئاهەنگ گێڕانەو هەر شتێکی دیکەی لەو بابەتەش لە جوغزی خواپەرستی دا نیە، تاکو سەری دنیایەمان لێ ویک بێتەوەو بڵێین: بیدعەتێکی دیکەش زیادبوو، کەواتە بۆ زانینی حوکمی چاکیو خراپی دەبێ تەماشای خودی خۆی بکەین، ئەگەر بێ شەرعی تێدابێ، یان بۆ مەبەستێکی خراپ بکرێ، یان بە شێوەیەک بکرێ کە زیانی بۆ ئیسلام هەبێو ئایین و خواو پێغەمبەری پێ سووک بن، ئەوکاتە دەڵێین: حەرامە، بەڵام نەک لەبەرئەوەی کە بیدعەتە! بەڵکو لەبەر ئەو بێ شەرعیو خراپەو زیانەی کە تێدان.

هـ - هەموو ئەو زاناو پێشەوایانەی کە

بیدعەتیان کردۆتە دوو بەش ، چاک و خراپ ( الحسنة والسیئة ) وەک ئیمامی شافیعی،[1] یان کردوویانەتە سێ بەش وەک ( العزّ بن عبدالسلام ) کە فەرموویەتی: بیدعەت یان موباحە یان چاکە یان خراپ ،[2] یان کردوویانەتە پێنج بەش وەک زۆر لە زانایان ، [3] دیارە چەمک و واتایەکی زۆر فراوانیان بۆ وشەی ناوبراو ڕەچاوکردوە کە هەم خواپەرستییەکان و هەم هەڵسوکەوتەکان ( العبادات والمعاملات ) بگرێتەوە .

لەکۆتایی دا :

دوو ئاگاداری گرنگم هەن خستنەڕوویان بەپێویست دەزانم :

---

(١) بڕوانە (فتح الباری) ج١٣ ص ٢١٣ .
(٢) بڕوانە ( حوار مع المالکی فی رد منکراته وضلالاته ) ص ٦٧ ، عبدالله بن سلیمان بن منیع .
(٣) بڕوانە ( فتح الباری ) ج١٣، ص ٢١٤ وە بڕوانە ( حوار مع المالکی .. ) ص ٦٧، ٦٨ لە ( تنبیه الغافلین ) ص ٣٢٠ ، ٣٢١ .

یەکەم : ئەو جۆرە مانا لێدانەوەیەی کە من بۆ وشەی ( بیدعـەت ) م هەڵبژارد ، من لەخۆمەوە ئەوەم نەکردووەو زانایانیش شتی وایان فەرمووە ، بۆ وێنە ( ابن حجر الهیتمی) فەرموویەتی :

( .. فان البدعة التی تعتریها الاحکام الخمسة ، ویقال ان منها حسنة وسیئة ، هی البدع فی العادات واما البدع فی العبادات فلا تکون الا سیئة کما صرح به المحققون ) .(١)

واتە : ئەو بیدعەتەی کە پێنج حوکمەکانی بەسەردا دێن و ، دەگوترێ چاک و خراپی هەیە ، ئەو بیدعەتانەن کە لەبواری عادەت و هەڵس وکەوتدا دەبن ، بەڵام بیدعەت لە خواپەرستییەکاندا ، ئەوە وەک لێکۆڵەرەوان بەراشکاوی فەرموویانە هەر خراپەو چاکی نیە .

---

(١) بڕوانە ( فتاوی رشید رضا ) ج٥ ص٢١١٢ لە ( حوار مع المالکی .. ) ص ١٧٩ .

دووەم : هەندێک شت هەیە کە لەبواری خواپەرستیدا داهێنراوە ،وەک فاتیحە خوێندن پاش نوێژەکان یان لەکاتی سەرەخۆشیو چوونەسەر گۆڕستان دا ، ئەمانە وەک لێکۆڵەرەوان ( محققون ) فەرموویانە ، هەرچۆنێکی بێ هەر خراپن و چاک نین ، مەگەر بە لایەکی دیکەدا لە پینەوپەڕۆو تەئویلیان بخەفتێین ، وەک ئەوە کە بڵێین :

ئەو فاتیحە خوێندنەی سەرەخۆشیو (تعزیە )و چوونەسەر گۆڕستان بۆ خەڵکی عەوامو نەخوێندەوارە ، چونکە ئەو دووعا تایبەتی یانە نازانن کە بۆو کاتانە دیاری کراون !

بەڵام فاتیحە خوێندنی دوای نوێژەکان بەم پینەیەش ڕەشەرع ناکەوێ !!

کەواتە : با کەسانێک کە بەو جۆرە شتانەوە ڕاهاتوون ئەگەر دیتیان خەڵکێکی دیکە نایانکات ، لێی دەست نەکەن بە پرتەوبۆڵەو لێی نەکەن بە

هەراو بگرەوبەردە، چونکە هەتا شتی تاوەو چاک لەوێ بێ هەموو کەس بە شتی پینەکراو قایل نیەو، ماقوولیش نیە جۆرە ڕەفتارێک کە بە تۆبزی و بە زەبری تەئویل ڕەشەرع دەخرێ لە خەڵکی بکەینە پایەو کۆڵەکەی ئیسلامەتی !! (1)

لە خوای میهرەبان داواکارم هەموو لایەکمان لەسەر ڕاستەشەقامی خۆی و ڕێبازی پێغەمبەرەکەی بەردەوام بکات.



---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە وێڕای ئەو سەرچاوانەی ڕابردن، سوودم لەمانەش وەرگرتوە:
١-(تلبيس ابليس) ابن الجوزي/ص ١٦،١٧.
٢-( الزواجر عن اقتراف الكبائر) ابن حجر الهيتمي/ج١ ص ٨٠،٨١.
٣-( دليل الفالحين) ج٢ ص ٢٠٤، ٢٠٥.
٤- ( فيض القدير) ج٦ ص ٣٦.
٥-(سبل السلام) ج٢ ص ١٣، ١٤.

## قسەی كۆتایی و وەسیەتم

مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست!

قسەی كۆتاییو وەسیەتی برایانەم بۆ تۆو بۆ هەموو مسوڵمانێكی دیكەی ژیرو بەمشوور ئەوەیە كە هەموومان هەموو هەوڵ و توانامان یەك بخەین لەپێناوی وەدەست هێنانی یەكدڵی و یەكڕیزی و یەكگرتنی زیاترو چاكترو قووڵتردا!

چونكە یەكگرتن ( الوحدە ) كە بەرهەمی یەكڕیزی و یەكدڵییە هۆی هەموو خێروخۆشیو بەختەوەری یەكی ماددی و مەعنەوی دنیاو دواڕۆژانە ، وە بەپێچەوانەوە پەرتەوازەیی(التفرقە) كە ئەنجامی شوومی جیاجیاییو چەندڕیزی یە زبلدان و زەلكاوێكە گەرای هەموو كێشەو گیروگرفت و دەردەسەری و ماڵ وێرانی یەكانی تێدا پەیدا دەبن و

ەترووکێن !

پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم ەوبارەوە فەرموویەتی: ( يدُاللهِ مَعَ لجَماعَة والشَيطان معَ منْ خالَف رکُض ) رواه الطبراني .(1)

جا لەبەر گرنگیو پێویستی یەکگرتنو یان و مەترسی پەرتەوازەیی بەپێویستم نی قولەباسێکی کورت و پوخت ەوبارەوە بنووسم بەناوی :

گرنگی یەکگرتن و زیانی پەرتەوازەیی"

- گرنگی یەکگرتن :

دەتوانین لە چەند خاڵێکی گوشراودا نگیو پێویستی یەکگرتن بخەینەڕوو :

- خوا و پێغەمبەر فەرمانیان بە یەکگرتن کردوە :

---

) بروانە ( فيض القدير شرح الجامع الصغير) ج6 ص 460 .

هەڵبەتە ئەو دەقانەش کە لە قورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوادا فەرمان بە یەکگرتن و بە یەکڕیزی دەکەن یەکجار زۆرن کە ئەمانە چەند نموونەیەکن :

یەک : ( واعتَصِموا بِحَبلِ اللهِ جَميعاً ولاتَفَرَّقوا .. ) آل عمران / ١٠٣ .

دوو : ( إنَّما المُؤمِنونَ إخوةٌ فَأصلِحوا بَينَ أخَوَيكُم .. ) الحجرات / ١٠ .

سێ : ( وإنَّ هٰذِهِ أُمَّتُكُم أُمَّةٌ واحِدةٌ وأنا رَبُّكُم فاتقون ) المُؤمِنون / ٥٢ .

چوار : ( إنَّ اللهَ يُحِبُّ الذين يقاتلون في سبيلهِ صَفاً كأنَّهم بُنيانٌ مَرصوص ) الصف / ٤ .

پێنج : ( المُؤمِن لِلمُؤمِنِ كالبُنيانِ يَشُدُّ بَعضُه بعضاً ) متفق عليه .

شەش : ( مَثَلُ المُؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد اذا اشتكىٰ مِنه عضوٌ تداعىٰ لَهُ سائِرُ الجَسَدِ بالسَهَرِ والحُمَّىٰ ) رواه احمد ومسلم .

٢- یەکگرتن بەرهەمی خوا بەیەکزانین (توحید) ە:

بەڵێ هەر کۆمەڵێک بەڕاستی خوا بەیەک بزانن و خوا بناسن، حەتمەن یەکدڵ و یەکڕیزو یەکگرتوو دەبن، چونکە قیبلەی دڵی هەموانیان یەکەو ئامانجی هەموانیان - کە ڕەزامەندی خوایە - یەکە، دیارە هەرکاتێکیش کۆمەڵە دڵێک ڕوویان لە یەک شت کردو لە دەوری یەک مەبەست کۆبوونەوە، یەک دەبن و خاوەنەکانیشیان یەکڕیزو پێکەوە جۆشدراو دەبن، هەربۆیەش خودا فەرموویەتی: ( ان هذه أمتكم أمة واحدة وانا ربكم فاعبدون) الانبياء /٩٢.

٣- یەکگرتن زەقترین درووشمی ڕێبازی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم:

ئەمە شتێکە وەک ڕۆژی ڕوون بە مێژووی ژیانی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەدرەوشێتەوە، چونکە

بەرلەوەی پێغەمبەر بێ هەم گەلی عەرەب لەنێوخۆی دا دابەش بوو بوو بۆ دەیان تیرەو هۆزی پێکەوە دژو وێک هەڵنەکەرو هەم گەلانی دیکەش هەردەم شەرو تیریان لێک دەسوون و بەگژ یەکدا دەچوون ، بەڵام پێغەمبەری سەردار صلی اللە علیە وسلم بە فەرمانی خوا ڕەنگی خەت و ڕێبازێکی ڕشت کە گەلی عارەب و باقی گەلانی دیکەی جیهانیش لەسەری خربوونەوەو ئوممەتێکی مەزنی یەکدڵ و یەکڕیزو یەکگرتوویان پێک هێنا ، خوا لەوبارەوە فەرموویەتی: ( .. واذكروا نِعمةَ اللهِ عَليْكمْ اذ كنتُمْ اعداء فألّفَ بينَ قلوبكمْ فأصْبَحْتمْ بنِعْمَتِه اِخوانا .. ) آل عمران / ١٠٣ .

٤- یەکگرتن گەورەترین خەسڵەتی هاوەڵان ( اصحاب ) ە :

بەڵێ هاوەڵە بەڕێزو هەڵبژاردەکانی پێغەمبەر رضی اللە عنهم لە هەموو کۆمەڵ و پشت ( جیل ) ێکی دیکە پتر

خەسڵەتە بەرزو پەسندەکانیان تێــدا هاتبوونەدی ، هەربۆیەش خوای مــەزن لەدوای پێغەمبەران علیهم السلام لــە قورئانیدا هیچ کەسی هێندەی هاوەڵــە بەرێزەکان مەدح نەکردوە ، وە هەربۆیەش پێغەمبەر صلی الله علیه وسلــم فەرموویەتی: ( خیرَ اُمَتی القَرنَ الــذی بُعِثتُ فیه ..) رواه مسلم .

جا گەورەترین خەسڵەتی بەرزی ئــەو بەرێزانەش بریتی بووە لە یەکدڵــی و یەکتر خۆشویستن و برایەتیو تەبایــی ، وەک خودا فەرموویەتی: ( محمدُ رَســولُ اللهِ والذین مَعَه اَشِداءُ علی الکفــارِ رُحماءُ بَینَهم ..) الفتح / ٢٩ .

٥- بەبێ یەکگرتن ئیسلام بەڕێوەنابرێ :

بەڵێ ئیسلامێک کە بەرنامەو پەیرەوی سەرلەبەرو هەموو لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانە بێگومان بە کۆمەڵێکی یەکریــزو تەباو یەکگرتوو نەبێ مەحاڵە بەڕێــوە ببرێ ، هەربۆیەش خوای زانا فەرموویەتی

( وَلتَكُن مِنْكُم أُمَةٌ يدعون الى الخير ويأمرُونَ بالمعروف ويَنْهون عن المنكر ..) آل عمران / ١٠٤ .

٤ـ يەکگرتن تاقە سەرچاوەی هێزە :

خوای زاناو وردبین لەوبارەوە فەرموویەتی: ( .. ولاتنازَعوا فَتَفْشَلوا وتَذهَبَ ريحُكُم ..) الانفال / ٤٦ .

هەڵبەتە لە پێکەوە خڕبوونەوەی دڵۆپە بارانە وردیلەکان و پێکهێنانی چۆم و ڕووباران و، پێکەوە هاوکاری کردنی مێروو و مێشەنگوینان و دروست کرانی شارە مێروولەی پڕ لە دانەوێڵەی عەمبارکراوو، چەندان شانە هەنگوینی ڕیزکراویش گەورەترین پەندو چاکترین بەڵگەی ڕاستی قسەی ڕابردوو وەردەگیرێ.

زانایەکی خواناس و ژیریش(١) ئەم وێنە دڵگیرەی لەوبارەوە هێناوەتەوە :

---

(١) ئەو زانا بەرێزە، پێشەوای ناودار ماموستا ( سەعیدی نۆرسی ) یە کە لە کوردەکانی بەشە کوردستانەکەی تورکیا بووە .

ئەگەر چوار ژمارەی یەک (١) مــــان
بەدەستەوەبن و بە پرژو بلاوی دایــان
بنێین و کۆیان بکەینەوە ئەنجامەکەیان
دەکاتە چوار (١+١+١+١=٤) بەلام ئەگــەر
هەر هەمان چوار ژمارەی ناوبراو پێکەوە
ریز بن و پال ویّک بدەن هێزو پــێــزو
ئەنجامەکەیان یەکجار زۆر دەبێ
کە دەکاتە هەزارو سەدو یازدە (١١١١)!!
٧- یەکگرتن بەلگەی سەلماندنی برایەتی‌و
یەکتر خۆشویستنە :
چونکە هەرکاتێک دوو کەس یان زیاتر
یەکتریان خۆش ویست و بەتەنگ یەکترەوە
بوون حەتمەن لێک نیزیک دەکەونــەوەو
بۆلای یەک دەچن ، ئەمە شتێکی ئاشکـراو
بەرچاوە ، کەواتە هەر گەل و کۆمەلێـک
هەول نەدەن هەرچی زیاترو چاکترو ساغتر
لێک نیزیک ببنەوەو لەیەک دا قــال
ببنەوەو پێکەوە جۆش بدرێن ، مانـــای
وایە گەورەترین و پتەوترین بەلگـــەو
شایەدی نابرایی‌و لێک جیایی بەدەستەوە

دەدەن و، خۆیان لە لیستەی پێکـــەوە دژان و وێک هەڵنەکەران ١٠ تۆماردەکەن.

ب- زیانی پەرتەوازەیی :

پەرتەوازەییو دووبەرەکی و جوغــز جوغزێنەو تاقم تاقمێنە دەردێکـــی کوشندەو پیسەو زیانی زۆرن کە ئەمانـە سەرەکی یەکانیانن :

١- پەرتەوازەیی گەورەترین هۆی بەزینە : چونکە ئەگەر ( یەکگرتن ) سەرچاوەی هێزوپێزو دەستەڵاتە ،( پەرتەوازەیـی ) ماک و میکرۆبی بێ هێزی و لاوازی یـەو بابای بێ هێزو لاوازیش بەشی هــەر تێشکان و بەزینە، وەک خوا فەرموویەتی ( .. ولاتَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ) الانفال / ٤٦ . واتە :

.. وە پێکەوە ناکۆک مەبن دەنـــا دەبەزن و هێزو پێزتان دەڕوات ..

٢- پەرتەوازەیی نیشانەی دەغەڵ و جوولەکانە :

خوای میهرەبان لەوبارەوە فەرموویەتی: ( .. تَحْسَبُهُمْ جَمِيعاً وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى .. ) الحشر/ ١٤ .

ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو مونافیقو دەغەڵانەی شاری مەدینە هاتەخوارێ کە لەبنەوە گفت و بەڵێنیان بە جوولەکەکانی ( بنی النضیر ) دابوو کە لەدژی پێغەمبەرو مسوڵمانەکان یارمەتیان بدەن و لەسەریان بکەنەوە !

٣- پەرتەوازەیی سەردەکێشێ بۆ کافربوون و وەرگەڕان :

خوای کاربەجێ لەوبارەوە فەرموویەتی: ( وَلاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ . يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ: أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ .. ؟! ) آل عمران / ١٠٥، ١٠٦ . وەک دەبینین

دوای ئەوەی فەرمانمان پێ دەکات کە وەک گەل و کۆمەڵانی پێشوو لێک پەرتەوازەو جیاجیا نەبین، دەیخاتەروو کە کەسانێکی ئاوا دەکەن لە رۆژی دوایی‌دا روویان رەش دەبێو بە سیفەتی (کافر) دەدوێنرێن !!

٤- پەرتەوازەیی عادەتی هاوبەش پەرست (مشرکین) انە :

خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی ( .. واقیموا الصلاة ولاتکونوا من المُشرکین . من الذین فرّقوا دینهم وکانوا شیعاً کلُّ حزبٍ بِما لدَیْهِم فرِحون ) الروم/ ٣١ ، ٣٢ . واتە :

.. وە نوێژ بەرپابکەن ولە هاوبەش پەرستان مەبن، لەوانەی ئایینەکەیانیان پرژوبڵاو کردو بوونە تاقم‌تاقم، هەر کۆمەڵە بەوەی کە لەسەریەتی دڵخۆشە !!

٥- بەهۆی پەرتەوازەیی یەوە لە ئوممەتی( محمد ) دەشۆرێین :

وەک خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی :

( ان الذين فرّقوا دينَهُم وكانوا شيعاً لَسْتَ مِنْهم في شئٍ ..) الانعام/ ١٥٩ .

واته: بێگومان - ئەی موحەممەد ! - ئەوانەی ئایینەکەیانیان پارچەپارچە کردو بوونە دەستەدەستە تۆ هیچ پەیوەندیت بەوانەوەوە نیە .. !!

( واته: ئەوانە لە ئوممەتی تۆ شۆراون ) !!

٦- پەرتەوازەیی‌و دووبەرەکی مایەی بێ عەقڵی یە :

چونکە خوای لێزان جل جلاله دەربارەی ئەو دەغەڵ و جوولەکانەی کە لە شاری مەدینەدا بە رواڵەت لە دژی پێغەمبەرو هاوەڵانی کەین و بەینیان پێکەوە کردبوو و کلکیان تێک هەڵبەستبوو، بەڵام لە دەروونەوە پەرتەوازەو جیاجیا بوون فەرموویەتی :

( .. تحسبهم جميعاً وقُلُوبُهُمْ شتّى ذلِكَ بأنَّهم قوم لا يعقِلون ) الحشر/ ١٤ .

واته: .. پێت وایە پێکەوە تەبان

بەلاَم دلَّیان جیاجیایە، لەسۆنگەی ئەوەوە کە کۆمەلَێکن نافامن !!

٧- پەرتەوازەیی هۆی بێ بەرەکەتی و دلَخۆشی شەیتانە :

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :( یَدُ اللهِ مَعَ الجماعةِ والشیطان مع من خالف یَرْکُضُ ) رواه الطبرانی والترمذی بلفظ نحوه .

واتە : دەستی خوا - مەبەست هێزو یاریدەدانی خوایە - لەگەلَ کۆمەلَدایە، وە شەیتان لەگەلَ ئەو کەسەدا رادەکات کە جیادەبێتەوە . وە لە ریوایەتی( ترمذی ) دا فەرموویەتی :

( ومن شَذَّ شَذَّ الیٰ النار) واتە :

وە هەرکەسێک ریزپەر بێ بەرەو ئاگر - ی دۆزەخ - دادەبرێ !!

ئێستاش با چەند مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ دەربارەی ( یەکگرتن و پەرتەوازەیی)بخەینەڕوو :

یەکەم: هۆیەکانی پەرتەوازەیی :

دەتوانین لە سێ خاڵان دا هۆیە بنەڕەتی یەکانی جیاجیایی و پەرتەوازەیی بخەینە بەرچاو :

١- لە ناسینی ئیسلامدا بەهەڵەداچوون :

بەڵێ سەرەکی ترین هۆی دابڕدابڕبوون و پەرتەوازەیی لەنێو مسوڵمانان دا بریتیە لە بەهەڵەداچوون لە ناسینی ئیسلامدا ، چونکە خوای پەروەردگار دەربارەی مەسیحی یەکان کە لەدوای حەزرەتی عیسا علیه السلام دووبەرەکیو پەرتەوازەیی یان تێ کەوت فەرموویەتی: ( ومِنَ الذين قالوا إنّا نصارىٰ أخَذْنا ميثاقَهُمْ فنَسُوا حظّاً مما ذُكّروا به فأغرَيْنا بينَهُم العداوةَ والبغضاءَ الى يوم القيامة ....) المائده/ ١٤ .

وەک دەبینین پەیدابوونی دوژمنایەتی وە بوغزو غەرەز ئەنجامو بەرهەمـــی بێ سێ و دووی فەراموش کردن و لەبیرخۆ بردنەوەی بەشێکی بەرنامەی خوایە !!

" فنسوا حظاً مما ذُکروا بە فاغرینا بَیْنَهم العداوةَ والبغضاءَ " . المائدة/ ١٤ .

ئنجا ئەو بەهەڵەدا چوونەش لە چەند(١) شێوەیەک دا خۆی دەنوێنێ ، وەک :

یەک : خۆ کورت هەڵێنان و ئیسلام گچکە کردنەوە لە جوغزی قسەو کتێـــب و بەرهەمو بۆچوونی چەند زانایەکی دیاری کراودا ، وەک جگە لەو کەسانە هیچ کەسی دیکە لە قورئان و سوننەت حاڵـــی نەبوویێ و ، حاڵیش نەبێ !!

دوو : خۆ شەتەک دان بە کۆمـــەڵ و بزووتنەوەیەکی دیاری کراوەوە ، کە تەجرووبەیەکی مێژووی ئیسلامـــەو ،

---

(١) بە تۆزێک دەستکاری یەوە لــە کتێبی ( یادی خودا ) وەرگیـــراوە ، بەرگی یەک / لاپەرە / ١٢٤، ١٢٥ .

پابەندی ی مووبەموو بە هەموو قسەو
بیرورا یەکی ئەو کۆمەڵ و جوولانەوەیەوە
وە ڕێگە بەخۆ نەدان بە خستنەڕووی هیچ
بیرکردنەوەو ڕەخنەو تێ بینی یەک!
سێ: چاو چڕداگرتن لەسەر چەند دەقێک و
ئیسلام کورت هەڵێنان لە یەکێک لە
لایەنەکانیدا، یان گەورەکر...ی لایەنێکی
ئیسلام لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکەی!
چوار: بە ئیشکیو سەرکێڵی تەفسیرکردنو
لێکدانەوەی هەندێک ئایەت و
ەرموودە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕووحی
ئیسلامو پرس‌کردن بەو زانا و
چاوساغانەی کە توانای شیکردنەوەو
کۆشش و هەڵهێنجانیان هەیە.
پێنج: گومانی بەد بە خەڵک بردن و
حوکمدان بە بەکافردانان(تكفير) ی
خەڵکی بەبێ لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی
ژیان و گوزەران و حاڵی‌بوون و حاڵی
نەبوونیان لە ئیسلام.
شەش: گەڕان بەدوای فەرمانە گرانەکان

( العزائم ) ی ئایین داو، گوێ نەدان بە مۆڵەتەکان ( الرخص ) و، دنیا لەخۆو لە خەڵکی وەتەنگ هێنان .

٢ـ خڵتە بەدڵەوە بوون :

بەڵێ دڵ نەخۆشیو ژەنگ وژار بەدڵەوەبوون هۆیەکی بنجی جیاجیایی و پەرتەوازەیی‌یە، وەک خوا فەرموویەتی : ( .. وما اختلَف فیه الا الذین اُوتُوهُ من بعدِ ما جائتهُم البیناتُ بغیاً بیْنَهُمْ ..) البقره/ ٢١٣ .

وەک دەبینین ( بغی) کە لێرەدا بە مانای حەسوودی یەو، حەسوودیش یەکێکە لە نەخۆشی یەکانی دڵ و دەروون ، بەو هۆو پاڵنەری پەرتەوازەییو جیاجیایی لەقەڵەم دراوە، جا لەراستیدا مسوڵمانان هەتا دەروونی خۆیان لە چڵک و چەپەرو خڵتەوخاڵی خەسڵەتە پیس و بەدە شەیتانیو دڕندەییو ئاژەڵی‌یەکان پاک نەکەنەوەو نەبنە خاوەنی دڵی ساغ ( قلب سلیم ) ناتوانن وەک پێویست

برایەتیو تەبایيو یەکریزی لەنیوخۆیان دا بێننەدی .

٣ـ سادەيیو بێ ئاگابوون :

سێیەمین هۆی سەرەکیو بنەرەتیی پەیدابوونی پەرتەوازەيیو تاقمتاقمێنە بریتیە لە سادەيیو فەقیرحاڵی و بێ ئاگایی ئەو کەسانەی کە لارێ دەڕۆن و لە رانێ دادەبڕێن، چونکە ئەگەر ژیرو داناو وردو تێگەیشتوو بن و بزانن چەندەیان پێویست بە مسوڵمانان هەیەو، دوژمن و ناحەزانیشیان چەند داخلەدڵ و بە بوغزو غەرەزن و چۆن لە دەرفەتێک دەخەفتێن کە زەفەریان پێ بەرن و لەنێویان بەرن، بەهیچ جۆرێک ملی کوێرە رێی جیاجیايیو پەرتەوازەيی ناگرن !

دووەم: ڕێگەی یەکگرتن :

دەتوانین ڕێگەو چۆنیەتی یەکگرتنیش لە سێ خاڵی سەرەکیدا بخەینەروو :

١- چاک لە ئیسلام حاڵی بوون :(١)

هەڵبەتە چاک لە ئیسلام حاڵی بوونیش زۆر شت دەگەیەنێ، بەلام من لێرەدا چەند شتێکم مەبەستە :

یەک : ئیسلام بەرنامەو پەیڕەوی سەرتاپای ژیانە ، سیاسی، ئابووری کۆمەلایەتی، سوپایی، مەعنەوی .. هتد کەوا بێ کورت هەڵێنان و گچکەکردنەوەی لە یەکێک لەو لایەنانەدا شتێکی هەڵەو بێ جێ یە .

دوو: ئیسلام بەرنامەیەکە بۆ بەڕێوەبردن و ڕێک وپێک کردنی ژیانی مرۆڤایەتی هاتوە لە هەموو چاخو

---

(١) ئەم باسەم بە تۆزێک دەستکارییەوە لە ( یادی خودا ) وەرگرت ، بڕوانە لاپەڕە ( ١٢٧ تا ١٣٢ ) .

سەردەمێک دا ، کەواتە نابێ بەناوی ئیسلامەوە ڕێ لە هیچ جۆرە داهێنان و گۆڕان و گەشەکردن و هیچ جۆرە زانیاری یەکی بەسوود بگرین بە بەهانەی ئەوەی کە گوایە دژی ئایینن ! چونکە هیچ کاتێک ئایینی ڕاست و عەقڵ و زانیاری ساغ وتەواو تێک ناگیرێن .

سێ: ئیسلام کاتی خۆی پلەپلە گەشەی کردو جێگیربوو، جا ئێستاش و لەمەودواش پێویستە ئەو پلەپلەیی ( تدرج ) یە لە بەڕێوەبردن و چەسپاندنی یاساکانی ئایین دا ڕەچاو بکرێ ، کەواتە پێش چەسپاندنی هێڵە گشتیو بفچینە سەرەکی یەکانی ئیسلام خۆ خافڵاندن بە چەند شتێکی لاوەکیو وردە بابەتەوە بێ جێ و بێ بەرهەمیشە .

چوار: ئیسلام بۆ خێرو خۆشی خەڵکی و دابین کردنی بەرژەوەندی و مافە ڕەوایەکانیان هاتوە، کەواتە

خستنەرووی ئیسلام وەک شتێکی داسەپێنراوو بێ حیکمەت و بێگا رێکی ئازاردەرو رێ بە بیرکردنەوەو پرسیار نەدەر، هەڵەیەو ئایینی خوای پێ ناشیرین دەکرێ، زانایانیشمان لە کۆنەوە فەرموویانە: ( أینما وجدت المصلحة فثمّ شرعُ الله ) بەرژەوەندی لەکوێ بێ شەرعی خواش لەوێ یە .

( هەڵبەتە هەموو بەرژەوەندی یەک نا، بەڵکو بەرژەوەندی یەکی راست و شەرعی)(1)

پێنج: ئاسانی رەچاوکردن یەکێکە لە درووشمەکانی ئیسلام، وەک خوا فەرموویەتی: ( يُريدُ اللهُ بكُمُ اليُسرَ ولا يُريدُ بكُمُ العُسْرَ) البقرة/ ١٨٦ .

رابەریشمان فەرموویەتی: ( بَشِّرُوا ولا تُنَفِّرُوا ويَسِّرُوا ولا تُعَسِّرُوا ) متفق عليه .

---

(1) بروانە ( ضوابط المصلحة في الشريعة الاسلامية ) محمد سعيد رمضان البوطي .

شەش : ئیسلام ئایینێکی زۆر فــراوان و دەوڵەمەندەو بەس بریتی نیە لـــە قسەو بەرهەم‌و بیروبۆچوونی چەنــد زانایەک ، کەواتە با دەمارگیــــری ( تعصب ) وامان لێ نەکات ئیسلام لـــە خەڵکی گچکە بکەینەوەو، رەحمەتـــی خوایان لێ تەسک بکەینەوە .

حەوت : بەرنامەی خوا ، خاوەنەکەی ناوی لێ ناوە ئیسلام : ( إِنَّ الدِّينَ عِنـــدَ اللهِ الاسلام ) آل عمران / ١٩ .

وە خوای کاربەجێ ناوی لە شویـــن کەوتووانی بەرنامەکەی ناوە ( مسوڵمان ) ( .. هو سَمَّاكُمُ المُسلِمينَ مِنْ قَبْلُ وَفـــي هذا ) الحج / ٧٨ .

کەواتە : با بەس مسوڵمان بیـــن و تەنیا ئیسلامی بین و هیچی دی ! بـــا بەهۆی داتاشینی ناوو نیشان و درووشمی جۆراوجۆرەوە دابردابڕ نەبین و نەبینە سەدو یەک تاقم !!

هەشت : لە ڕوانگەی ئیسلامەوە هیچ کەس مافی ئەوەی نیە بڵێ تێگەیشتنی قورئان و سوننەت لەسەرمن تاپۆکراوە کەواتە با قسەو بیروبۆچوونی خۆمان لە خەڵکی نەکەینە ئایین و، با هەروەک چۆن مافی بیرورا دەربرین بە خۆمان ڕەوا دەبینین بە خەڵکی دیکەشی ڕەوا ببینین، بەکورتی با ئەم قسەیە بکەینە بنچینەی پێکەوە ڕەفتارکردنمان " نَتعاوَنُ فيما اتفقْنا فيهِ ويُعذِرُ بَعضُنا بَعضاً فيما اختَلفْنا فيهِ ". (١)

٢- دڵ و دەروون ساغ بوون :

دووەمین پێکهێنەری ڕێگەی یەکگرتن بریتیە لە دڵ و دەروون ساغ بوون، مەبەستیشم لە دڵ و دەروون ساغبوون ئەوەیە کە ئینسان لەگەڵ خوادا ڕاست و

---

(١) ئەم قسەیە ئی پێشەوای شەهید ( حسن البنا ) یە، خوا لێی خۆش بێ.

ساغ بێت و، لەگەڵ خەڵکیش دا چاک و پاک بێت، هەڵبەتە چاکیو پاکیش لەگەڵ خەڵکیدا ئەنجامو بەرهەمی ڕاستیو ساغیە لەگەڵ خوادا، خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی: (.. فاتَّقوا اللهَ واَصلِحوا ذاتَ بينِكمْ واطيعوا الله وَرسولَهُ اِن كُنتم مؤمنين) الانفال / ١٠

وەک دەبینین خوای قسەلەجێی بەرلەوەی پێمان بفەرموێ: (نێوانتان چاک بکەن (اَصلِحوا ذاتَ بينِكم) فەرموویەتی: (پارێز لە خوا بکەن (فاتقوا الله)، چونکە وەک گوتمان لەگەڵ خەڵکی چاک بوون ئاوێکی شیرین و زوڵاڵە لە کانیاوی سازگاری پارێزکاری (تقوى) یەوە هەڵدەقوڵێ!

کەواتە: با لە ڕێی فەرمانبەری خواو پێغەمبەرەکەیەوە صلی الله علیه وسلم هەوڵ بدەین هەرچی پتر پارێزکاری لە خۆمان دا بێنینەدی، تاکو بەهۆی پارێزکاریشەوە دڵێکی وا وەدەست بێنین

کە بە مەعنای وشە ساغ ( سلیم ) بێ و ، هیچ جۆرە خڵتەیەکی سیفەتە بەدەکانی وەک : بوغزو غەرەز ، حەسوودی ، ڕیابازی خۆبەزلگرتن ، فێڵ و فەرەج ، خۆپەسندی خەڵک بەکەمگرتن ، بەدگومانی ، لەخۆبایی بوون و .. هتدی پێوە نەبێ .

٣ـ ئاگاداری و وریابوون :

ئاگاداری و وریایی‌و دۆست و دوژمن ناسین و ، شارەزابوون بە بارودۆخ‌و دەوروبەر ، پەی بردن بە فێڵ و پیلان و نەخشە گڵاوەکانی دوژمن و ناحەزانمان ، کە پیسترینیان پیلانی پەرتکەو زاڵبە ( فرق تسد ) یە ، هەرجێکی دیکەی یەکجار پێویستە بۆ هەر گەل و کۆمەڵێک کە بەوێ ڕێگەی یەکدڵی‌و یەکریزی‌و یەکگرتن بگرێتەبەرو ، خەرمانی جموجۆڵ و کارکردن و ماندووبوونی بە پریشکی ئاگری جیاجیایی‌و پەرتەوازەیی‌و ناقمتاقمێنە نەسووتێ .

## سێیەم: یەکدڵی نەک یەک بیری

ئەوەی کە دروست بوونی یەکریزی و یەکگرتن پەکی لەسەری کەوتوە، یەک دڵی یە نەک یەک بیری؛ چونکە:

یەکەم: یەک بیری و هەوڵ دان بۆ یەکخستنی بیروبۆچوونەکان لە هەموو شتێکی وردو درشتدا شتێکی مەحاڵ و نەگونجاوەو سەربارەش ئەگەر گریمان بێتەدیش دەبێتە هۆی پەیدا بوونی نەخۆشیەکی زۆر پیس و کوشندە کە بریتیە لە لاساکردنەوەو ئیشکی (التقلید والجمود) و کۆنەپەرستی.

دووەم: ئەگەر دڵەکان یەک بن و پێکەوە گرێ بدرێن و، خۆشەویستیو برایەتی و پەیوەندی توندو پتەو لەنێو خاوەنەکانیان دا بێتەدی، جیاوازی بیرورا (اختلاف الرای) ناتوانێ سەرنکێشێ بۆ دابڕدابڕبوون و پەرتەوازەیی، بەڵام ئەوەی کە ئاگری

بێ ئامان و بەڵای ناگەهانە بوغزو غەرەزو لێک جیایی دڵانەو، لەکاتی لێک دوور بوونی دڵان دا یەکبوون و لێک نیزیکی عەقڵان هیچی لەدەست نایەت و هیچی پێ تێ هەڵنایەتەوە .

سێیەم: هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر خوا لێیان ڕازی بێ هەرچەندە یەکجار یەکدڵ و یەکڕیزو پێکەوە براو تەبا بوون، کەم و زۆر بیروڕاو بۆچوونەکانیان لێک جوێ بوون و، بەشێوەی جۆراوجۆر بۆ مەسەلان دەچوون، بەڵام چونکە یەکدڵ و تەبا بوون و لە دەروونەوە پێکەوە جۆشدرابوون، ئەو بیروڕاو بۆچوونە لێک جوێ بووانەیان نەبوون بە مایەی پەرتەوازەیی و دووبەرەکییان، بەڵکو بوو بەهۆی فراوانی و دەوڵەمەندی ئیسلام و زۆربوون و جۆراوجۆربوونی یاساو تەجرووبەکانی . (١)

(١) ئەو جەنگ و هەرایانەش کە لەنێوان (علی)و رضی الله عنه نەیارەکانی دا

هەروەها ڕاناو پێشەوا موجتەهیــــــدە کانیشمان بەهەمان شێوە، ویـــــــــڕای یەک دڵیمان بیروڕای جوێ جوێ یـــــان هەبووە،

لە قورئانیش دا زۆرجاران مەسەلـەی دڵ پێکەوە گرێ دران باسکراوە، بـەڵام تاقە جارێک باسی یەک بوونی عەقـڵان نەکراوە، بۆ نموونە خوا فەرموویەتی:
(.. هوَ الذی أیّدکَ بنَصْرِهِ وبالمُؤمنینَ. وألّفَ بیْنَ قلُوبِهِم..) الانفال /٦٢، ٦٣ .

بەڵام پێویستە ئەوەش بگوترێ کـــە ئێمە دەڵێین : یەکگرتنی عەقـــــڵ و هۆشەکان مەرجی یەکگرتن نیەو پێویســت نیەو، شتێکی گونجاویش نیە، مەبەستمان هێڵە گشتیو بنچینە سەرەکی یەکانـــی

................................

ڕوویان دا زیاتر پەیوەندی یان بــــە نەخۆشیو ناتەواوی دڵ و دەروونـــــی نەیارەکانەوە هەبوو ـ بەتایبەتـــی موعاویە ـ نەک جیاوازی بیــــــرورا ، هەرچەندە زۆرکەس ئاواش حاڵی نەبوۆە .

ئیسلام نیە، چونکە بەبێ رێک کەوتن (اتفاق) لەسەر هێڵ و بنچینە گشتی - یەکانی ئیسلام، نەک هەر یەکگرتن و یەکریزی مەحاڵن، بگرە یەکدڵیش هەر نایەتەدی، چونکە بۆ پێکەوە بەستران و کۆبوونەوەی دڵەکان حەتمەن دەبێ زەمینەیەکی گونجاو هاوبەش هەر هەبێ، دەنا هیچ شتێک لە بۆشاییدا نایەتەدی.

چوارەم: یەکگرتن دەبێ لەسەر بنچینەی هەق بێ:

بەڵێ ئێمە کە چەند لەمێژە مەدحی یەکریزی و پێکەوەجۆشدران و یەکگرتن دەکەین، مەبەستمان ئەو یەکریزی و یەکگرتنەیە کە لەسەر بنچینەی هەق دادەمەزرێ، وە کە زەمی پەرتەوازەیی و جیاجیاییش دەکەین مەبەستمان ئەو جیابوونەوەیە کە لە هەق دوور دەکەوێتەوەو لە کۆمەڵی هەق و شەرعی و

ڕاستدادەبڕێ، دەنا ئەگەر هەموو جۆرە یەکگرتنێک هەر پەسندو چاک بێ فیرعەونیەکانی میسرو نەمروودی یەکانی عێراق و بتپەرستەکانی مەککەی دوێنێو، ناصرییەکان و عەفلەقییەکانو نەتەوەپەرستەکانی ئەمڕۆش کە لەسەر بنچینەی ناهەق ( باطل ) کۆبوونەوە دەبێ وەبەر ئەو مەدحە بکەون !

وە ئەگەر هەموو جیابوونەوەیەک خراپ بێو بێ شەرعی بێ، دەبێ جیابوونەوەی موحەممەدو هاوەڵانی لە هاوبەش پەرستەکانی مەککەو، دابڕانی حوسەینی کوڕی عەلی خوا لێیان ڕازی بێ لە یەزیدو، دوورکەوتنەوەی تێکۆشەرانی ئەمڕۆی ئیسلام لە ڕژێمە نائیسلامی یەکانیش هەر خراپ و بێ شەرعی بێ !!

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين .

٢ / شوال / ١۴٠٩

سەردەشت

## نیـــــوەرۆک

| لاپەڕە | بابەت |
| --- | --- |
| ٥٦ | ئەنجامگیری |
| ٦٥ | بەندی سێیەم: خواپەرستیەکی ساڵحانە |
| ٨٤ | دوو ئاگاداری |
| ٨٩ | بەندی چوارەم: خوو و ڕەوشتێکی خوایی یانە |
| ١٠٩ | بەندی پێنجەم: جیهادکردنێکی مەردانە |
| ١٢٧ | بەشی دووەم: بۆچوون و هەڵوێستەکان |
| ١٢٨ | ڕوونکردنەوەیەکی پێویست |
| ١٣١ | بەندی یەکەم: قورئان و سوننەت |
| ١٤٣ | بەندی دووەم: هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم |
| ١٥١ | بەندی سێیەم: زانا و میراتگرانی ڕەسەنی پێغەمبەر |

| لاپەڕە | بابەت |
| --- | --- |
| ١٦٠ | بەندی چوارەم: مەزەبەکان |
| ١٨٩ | چەند پێناسەیەکی گرنگ |
| ١٩٣ | بەندی پێنجەم: تەریقەت و تەصەووف |
| ٢٠٧ | بەندی شەشەم: کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامی و نائیسلامی یەکان |
| ٢١٧ | بەندی حەوتەم: ئەهلی قیبلە (ئوممەتی موحەممەد) |
| ٢٣٧ | پاشکۆیەکی گرنگ |
| ٢٣٩ | زانیاری |
| ٢٤٣ | سیاسەت |
| ٢٤٥ | دادگەری |
| ٢٤٧ | نەتەوایەتی |
| ٢٤٩ | کورد |
| ٢٥٢ | ئافرەت |
| ٢٥٤ | ئازادی |
| ٢٥٧ | بیدعەت |

دوو ئاگاداری

١- ئەم نووسراوە لەسەر ئەرکـــــــی ( بیت المال ) ی هێزی هەمـــــــزە چاپکراوەو مایەکەشی هەر بۆ وێ دەگەڕێتەوە .

٢- هەرکەسێک گلەیی لە نرخەکەی هەبـــوو با بپرسێ داخوا چەندی تێ چووە !!

